سەرپەرشتی گشتی
شێرکۆ بێکەس
بەڕێوەبەری ڕۆڤار
دڵشاد عەبدوڵلا
سکرتێری رۆڤار
یاسین عومەر
سەرپەرشتیاری هونەری
قادر میرخان
هەڵەچنی
ناسك عەزیز محمد

مونتاجی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سەعید

# ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

| | |
|---|---|
| 1-ئیبراهیم ئەحمەد | 12-مەولانا خالیدی نەقشبەندی |
| 2-محەمەد مەولود (مەم) | 13-جەمال عیرفان |
| 3-کەمال مەزهەر | 14-مەلا عەبدولکەریمی مودەریس |
| 4-لەتیف حامد | 15-جەلالی میرزا کەریم |
| 5-سوارەی ئێلخانی زادە | 16-ئیسماعیل بێشکچی |
| 6-محێدین زەنگەنە | 17-عەبدول خالق مەعروف |
| 7-ئەحمەد هەردی | 18-هێمن |
| 8-یەڵماز گۆنای | 19-حسێن حوزنی موکریان |
| 9-محەرەم محەمەد ئەمین | 20-ئەمین فەیزی بەگ |
| 10-دڵدار | 21-کامەران موکری |
| 11-مەستورەی ئەردەڵانی | |



ستار قادر
لەچەند دێڕێکدا:

-1968 لە شاری سلێمانی لە مەجیدبەگ لەدایکبوە.
-1089 پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی بەشی وێنەکێشان بە پلەی یەکەم تەواوکردوە.
-2002ئەکادیمیەی هونەرە جوانەکانی لە زانکۆی سلێمانی تەواوکردوە.

**پێشانگە تایبەتەکان:**

-ساڵی 1987 یەکەم پێشانگەی تایبەتی کردۆتەوە کە تایبەت بە هێلکاری لە هۆڵی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی.
-ساڵی 1989 دوەم پێشانگەی تایبەتی کردۆتەوە لە هۆڵی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی.
-ساڵی 1998 سێیەم پێشانگەی تایبەتی لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی کردۆتەوە.

**پێشانگە بەشدارییەکان:**

-پێشانگەی ساڵانەی ئەکادیمیەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی زانکۆی سلێمانی ساڵانی 1998–2002.
-بۆ ماوەی دوو ساڵ وەك مۆتیڤێست لە ڕۆژنامەی هەرێمی کوردستان ساڵانی 1998–2000.
-نەخشەکێشان و مۆتیڤ کێشان بۆ چەند کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ناوچەی هەرێمی کوردستان.
-ئێستا مامۆستایە لە سەنتەری چالاکی گەنجان بەشی شێوەکاری.

## ژمارەکانی داهاتوو تایبەتن بە:

-عەلی ئەشرەف دەروێشیان
-هەژار موکریانی
-محەمەد ساڵح دیلان
-عەلی مەردان


(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیریە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوو مانگ جارێك دەریدەکات
ناونیشان
سلێمانی -فولکەی یەکگرتن -دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار ت / 3120690
لەدەرەوەی کوردستان Tel: 00441628477660 - Fax: 00441628486008
E-mail.
www.sardam.net\web mail
چاپخانەی (ڕەنج)

# جەلال تەقی..
# ئەو پرۆژەیەی کە تەواو نەبوو

**محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق**

**مامۆستا جەلال تەقی نووسەرو وەرگێڕی پایەبەرز لە 1993/9/5دا بە نەخۆشی دڵ سەری نایەوەو لە کوردستانی ئازادی فرە حزب و فرە ڕۆژنامەو تەلەفزیۆن و ڕادیۆدا لایەك نەبوو بۆ ساتێکیش بێت خەمەکانی ئەم مرۆڤە مەزنە ڕاژەنێ و ئاوڕێکی وەفاو پێزانین لە ئەرك و ماندوبونی 30 ساڵی تەمەنی کورتی پەنجاو ئەوەندە ساڵی بداتەوە کە پڕ بوون لە چالاکی و نەسرەوتن لە پێناوی خزمەتکردنی ئەدەب و هونەرو مێژوو و کەلەپووری میللەتەکەیداو، شایەتی حاڵیش دوانزە* کتێبی چاپکراو و پانزەی دەسنوسن کە زۆربەیان وەرگێڕانی شاکاری نوسەرە بەناوبانگەکانی وەك دۆستۆیڤسکی و چیخۆف و مەکسیم گۆرکی و گۆگۆڵ و چەندینی تر لە زمانی ڕووسییەوەو بە کوردییەکی ڕەوانی وا کەم نووسەرو زمانزانی کورد بگاتە ئاستی. ئەم پیاوە، بێجگە لەو نوسین و وەرگێڕانە بە پێزانەی لە ڕووپەڕی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە، 1850 لاپەڕەی چاپکراوی ئەنجام داوە لەگەڵ 2906 لاپەڕەی دەسنوسدا.**

**کورتەیەکی ژیان و چالاکی ئەم نوسەر و وەرگێڕە مەزنە :**

**–ساڵی 1939 لە سلێمانی لەدایکبووەو هەر لەم شارە قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی تەواوکردوە.**

**–ساڵی 1960 لەبەر زیرەکی و سەرکەوتنی لە خوێندنی ئامادەییدا و بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا نێرراوە بۆ مۆسکۆ.**

**–ساڵی 1967 کۆلیجی ئەندازەی بیناسازی لە مۆسکۆ تەواو کردووە. ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد بووە لە ئەوروپا.**

**–لە ناوەڕاستی ساڵانی شەستدا کچە ڕووسێکی مۆسکۆیی بە ناوی (نینا) دەبێتە هاوسەری و لەگەڵیدا دێتەوە بۆ وڵات، بەڵام لە سەرەتای ساڵانی حەفتادا ئەم ژنە بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی دەکات و کچێکی بەناوی (ئاڵا) لێ بەجێ دەمێنێ.**

**–ساڵی 1967 دەگەڕێتەوە بۆ عێراق و لە وەزارەتی کاروباری باکوور دادەمەزرێ و پاشان دەگوێزرێتەوە بۆ فەرمانگەی ئەشغال لە سلێمانی و وەك ئەندازیارێکی بیناسازی و پاشانیش تا دوا ماڵئاوایی وەك لێپرسراوی بەشی تەکنیکی ئەو فەرمانگەیە کار دەکات.**

**ساڵی 1974 خاتوو نیعمەتی حاجی ئەحمەدی مەڵکەندیی لە سلێمانی دەبێ بە هاوسەری دووەمی، لەمیش تەنها کچێکی هەیە بەناوی (لانە)وە. نیعمەت خان ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە لە پیت و بڕشتی کاری وەرگێڕانی کاك جەلالداو بەردەوام بەرهەمەکانی بۆ پاکنوس کردووەو زەمینەی کارکردنی بۆ خۆش کردووە.**



جەلال تەقی لە 18 ساڵیدا

**–هەر بە منداڵی باوکی دەمرێ و دەکەوێتە لای (ئەحمەد تەقی)ی پورزای و هەموو جار بە ڕێزەوە یادی دەکردەوەو دەیوت: (لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییدا بووم کە باوکم کۆچی دوایی کرد، دوای ئەو خاڵە ئەحمەد تەقی) پەروەردەی کردم، بە ڕاستی من بەرهەمی ئەوم؟ ئەم پیاوە کە کۆنە ئەفسەرێکی سەردەمی عوسمانلی دەبێت، ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە لە پێگەیاندنی کاك جەلالداو بایەخێکی باشی داوە بە کتێب و خوێندنەوە. کاك جەلال و خوشکەکانی لە ڕێزو خۆشەویستیدا بە (کاکەفەنی) بانگیانکردووە، تەنانەت کە ئەحمەد تەقی لە ساڵی 1960دا کۆچی دوایی دەکا، کاك جەلال کە پێشتر بە ناوی (جەلال پەرێشان)ەوە نووسینەکانی خۆی لە ژین و هیواو شەفەقدا بڵاودەکردەوە، بۆ ڕێزلێنان و ئەمەك دەربڕین و پێزانینی ڕۆڵی ئەحمەد تەقی لە**

ژیانیدا نازناوی خۆی لە (پەرێشان)ەوە گۆڕی بۆ (تەقی) و ئیدی لەوکاتە بەدواوە (جەلال صالح مەحمود) یان جەلال پەرێشان بە (جەلال تەقی) ناسرا.

-کاك جەلال هەر لە تەمەنی لاوێتییەکی زووەوە دەستی کردووە بە نووسین و بە تایبەتی لە بواری چیرۆکدا بەلام پاشتر لە بواری وەرگێڕان لە ڕووسییەوە پتر ناوی دەرکردو خزمەتی گەورەی خۆی گەیاند.

ئەم پیاوە لە وەرگێڕاندا هێجگار کارامەو ورد بوە و داهێنانی لە بنەماکانی ئەو هونەرەدا کردوەو هەر بە وەرگێڕانی دەقەکەوە نەوەستاوە بەلکو چەندین پەراوێزی ڕونکردنەوەی ناو جێگاو کەسانی تێدەخست بۆ ئەوەی خوێنەری کورد تەواو ئاشنا بکات لەگەلّ کەش و هەواو ناوەڕۆکی ئەو بەرهەمەدا کە وەری دەگێڕاو بۆ ئەم مەبەستەش گەلێ سەرچاوەی جۆراو جۆری دەپشکنی.

-کاك جەلال لەپالّ ئەوەدا کە خۆی تەرخان کردبوو بۆ وەرگێڕان، دەیپەرژایە سەر گەلێ بواری تر، لە وێنەکێشاندا دەستڕەنگین بوو و گەلێ لە نیگار و هێلکاریی ناوەوەی کتێبەکانی خۆی ئەنجامی داوە. هەروەها وەستایەکی چاك بوو لە دارتاشی و ئاسنگەری و بەرگدوورینداو کەرەسەو تفاقی ئەم کارانەشی گشت هەبوو.

هەر لە منالّییەوەو لەژێر کارتێکردنی ئەحمەد تەقی خالّیدا کتێبخانەیەکی بنیات نابوو و لە ماوەی خوێندنی ئەندازەشیدا لە مۆسکۆ لەهەر سەردانەوەیەکدا بۆ ولات لە جیاتی دیاری و ئەنتیکە جانتاکەی پڕ لە کتێب دەکردو دەیهێنایەوە. جارێکیان ئەنیسکلۆپیدیایەکی سەردەمی ڕووسیای قەیسەریی دەستکەوتبوو کە لە سالّی 1902 چاپکرابوو، لە ناردنەوەی بە پۆستەدا زەحمەتی زۆری کێشابوو، تەنانەت خۆی گەیاندبووە وەزارەتی ڕۆشنبیری سۆڤێت و دوای بێنەو بەرەیەکی زۆر ئەو جا ڕێگەیان دابوو ڕەوانەی بکاتەوەو پێیان وتبوو ئەمە هی گەل و دەولەتی سۆڤیەتەو نابێ ببرێتە دەرەوە.

-کاك جەلال ئەگەرچی پابەندی هیچ لایەنێکی سیاسی نەبووە بەلام کوردپەروەرێکی بێگەردو پێشکەوتنخواز بووەو.. هەردەم


جەلال تەقی و نعمەت خانی هاوسەری 1974

خاوەنی هەلّوێستی مەردانە بووەو لەهەر بوارێکدا توانای بووبێ خزمەتی نەتەوەکەی بکا، دریغیی نەکردووەو بۆ نموونە جارێکیان گێڕایەوە: "کە قوتابی بووم لە مۆسکۆ، لە سەردەمی بریجنێڤدا، بروسکەیەکم نارد بۆ ڕۆژنامەی پراڤدا، هێرشم کردبووە سەر ڕژێمی عێراق و داواشم کردبوو کە بریجنێڤ پشتگیری گەلی کورد بکات و دژی ڕژێم بوەستێ! کاتێکم زانی بانگ کرام بۆ لای سەرنووسەری ڕۆژنامەی ناوبراوو، دوای تێڕامانێکی زۆر وتی: لەبەرئەوەی کوڕێکی گەنجی ئەمجارەیان قەیناکە، بەلام دووبارەی نەکەیتەوە، چونکە بەپێی یاسا کارێکی زۆر خراپت کردووە. منیش پێم وت: لە پێناوی بەرژەوەندی گەلەکەمدا لە هەموو دەرگایەك دەدەم.

-ئەم پیاوە هەرچەندە ئەندازیارێکی بیناسازیی زیرەك بوو، بەلام قەت ئەو پیشەیەی بەکارنەهێنا بۆ دەولەمەند بوون، بەلکو کاری ئەدەبی و پرۆژەی وەرگێڕانی پێ پیرۆزتر بوو لە خزمەتکردنی گەلەکەیدا. ئەوەندەی بەس بوو وەك وەزیفەی ئەندازیار و پاشان بەرپرسی بەشی هونەری بێت لە دائیرەی ئەشغالی سلێمانیدا. لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری 1991 ڕۆلێکی بەرچاوی بوو لە چەند پرۆژەیەکی ئاوەدان کردنەوەی گوندەکانی کوردستانداو بەش بە حالّی تواناو دەسەلاتی خۆی نەیدەهێشت فلسێك بە فیڕۆ بچێت لەو بوارەی کە خۆی دەستی بەسەردا دەشکا. بەلام بە داخەوە دەردەسەری زۆری تووش بوو وەك خۆی دەیگێڕایەوە فرە جار تەماع دەکرایە سەر کارگەو کەرەسەو ئامێری دائیرەکەی بۆ تالان و ئاودیوکردنیان ئەمیش وەك بەرپرسی تەکنیکی ئەو دەزگایە هەرگیز ڕێی پێ نەدەدان و لەبەردەم فرت و فێلّ و هەڕەشەو گوڕەشەی کەسانی مفت خۆرو چلّێس و کوردستان وێرانکەردا وەك بەردی ڕەق دەوەستاو لوتی دەشکاندن.

**پرۆژەی ئەو فەرهەنگەی تەواو نەبوو:**

کاك جەلال لە وشەی کوردیی ڕەسەن کۆکردنەوەو کاری فەرهەنگ سازیدا هیچی لە وەرگێڕان و بوارەکانی دیکەی چالاکی ئەدەبی کەمتر نەبوو. دەمێك بوو سەرقالّی ئەم بوارە بوو و کەرەسەی خۆیشی تێداخستبوو. سەرەتای سالّی 1992 لە سلێمانی لەگەلّ سێ برادەری تردا (مامۆستایان عوسمان هەورامی و عەبدوللا حەسەن قادرو فاروق محەمەد ڕەمزی) کە هەرچواریان بێجگە لە دۆستایەتی و خەمخواردنی ئەم لایەنە، کۆمەلّەی کەلەپوور و فۆلکلۆری کورد کۆی کردبوونەوە، بڕیاریان دا کارێکی بە کۆمەلّ بکەن بۆ ئەنجامدانی قاموسێکی کوردی-کوردی کە لە قاموسەکانی تری ئەم بوارە بەرفراوانتر بێت، بە تایبەتی کە هیچ کام لە فەرهەنگەکانی تر تەواوی وشەکانی زمانی کوردیان نەگرتووەتەوە.



کاک جەلال ماڵەکەی خۆی بۆ تەرخان کردن و ڕۆژانە هەرچواریان ماوەی سێ و چوار سەعات کاریان لەسەر دەکردو ڕۆڵ و چالاکی کاک جەلالی تێدا زۆر کاریگەر بوو. پاش نزیکەی ساڵ و نیوێك کارکردن توانیان دەوری 13 هەزار (سیانزە هەزار) وشە تەنها لە پیتی (ئەلف)دا کۆبکەنەوەو هیچ فەرهەنگێکی پێش ئەمان لەم پیتەدا نەیگەیاندوەتە سێ هەزار وشە. بەڵام پێش کۆچی دوایی کاک جەلال کارەکە وەستاو لەوە زیتری لێ ئەنجام نەدرا چەند هەزار وشەیەکی پیتی (بێ) نەبێت کە لە کاتی کاردا لەسەر پیتی (ئەلف) خستوویانەتە سەر کارتی جیاواز. ئێستا ئەم بەرهەمە ناوازەیە لە بەرگێکدا ئامادەکراوەو لە فرە دەرگا دراوە بۆ چاپکردنی بەڵام لەبەر خەرجی گەورەو گرانی چاپ و کاغەز نەتوانراوە هیچ بکرێت.

**جەلال تەقی و کۆمەڵەی کەلەپوور و فۆلکلۆری کوردو هەندێ یادگاری شیرین**

پایزی ساڵی 1991 ئەم کۆمەڵەیە لەلایەن چەند ڕۆشنبیرو نووسەرێکی وێڵ و شەیدای بواری کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوە لە سامانی کەلەپووریی میللیمانەوە دامەزراوە وەك کۆمەڵێکی سەربەخۆو پابەند نەبوو بە هیچ حزب و لایەنێکەوە بەرنامەی خۆی داڕشت. مامۆستا جەلال تەقی زۆری پێ خۆش بوو بێتە کۆمەڵەیەکی ئاوهاوەو ڕەنج و کۆششێکی بەرچاویشی هەبوو، لەم ڕووەشەوە هەر لەهەردوو بەرگی شەوانی گوێ ئاگردانەوە (کۆمەڵە حەکایەتێکی فۆلکلۆری و ئەفسانەی کوردەوارین و بەرگی یەکەم چاپکراوەو دووەم دەسنووسە) تا دەگاتە کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوە لەسەر داب و نەریتی ژیانی کوردەواری بە تایبەتی لای کوردەکانی یەکێتی سۆڤێتی جاران و بەردەوام گۆڤاری (کەلەپووری کورد)ی بە بابەتی بەپێزی فۆلکلۆری دەوڵەمەند دەکرد.

کاك جەلال هێند ڕوح سووك و بێ هەوا بوو بەو گشت تواناو بەهرەیەوە هەر زوو دەبوو بە دۆستی گیانی بە گیانی ئەو کەسانەی بە ڕوح و دەروونی ئاشنا دەبوون و، هەرگیز تێرت نەدەخوارد لە هاودەمی و قسەی خۆشی و جیاوازی تەمەن لەو پەیوەندییەدا دەتوایەوەو بەمەش پتر لە چاوی ئێمەدا گەورە دەبوو. ڕۆژانی چوار شەممە ئەو و برادەرانی پرۆژەی فەرهەنگ ئێشکگر ئەبوون لە بارەگای کۆمەڵە، کە تاقە ژوورێکە لە بینای تۆفیق قەزازدا بە کرێمان گرتووە. کاك جەلال بەسەری سپی و تەمەنی سەروی پەنجایەوە دەکەوتە گسکدان و پاککردنەوەو ڕێکخستنی ژوورەکەو نەیدەهێشت کەس پیسی بکات و، لەم ڕۆژەداو بە خۆشیی ڕوح سووکی و قسە بەتامەکانی ئەوەوە بارەگای کۆمەڵە جمەی دەهات لە ئەندامان و خەڵکی میوان.

ئێمە هەر زوو قەدری ئەم زاتەمان زانی و هیوای زۆرمان پێ بوو لە پێشخستنی کاروباری کۆمەڵەداو، تەنانەت کە لە 20–1992/25/25 پێشانگایەکی میهرەجان ئامێزی گەورەی فۆلکلۆریمان کردەوە لە شاری سلێمانی کەسمان لەو بە بەرێز نەزانی بۆ کردنەوەی ئەو پێشانگایە. لە ڕێو ڕەسمی بە خاك سپاردن و پرسەکەشیدا ئەندامانمان دەستەونەزەر لە حوزووری گیانی پاکیدا وەستابوون. بە هاوکاری لقی سلێمانی هەردوو یەکێتی نووسەران و ئەندازیاریان چلەیەکی ماتەمینی پڕ شکۆمان بۆ سازداو ژمارە سێی گۆڤاری (کەلەپووری کورد)مان بە یادی ئەو پیاوە مەزنەوە دەرکرد.

بەڵام داخم ناچێ، لەبەرئەوەی ئەم پیاوە بە هێمنی و دوور لە خۆدەرخستن کاری ئەدەبی و ڕۆشنبیریی خۆی دەکردو خزمەتێکی گەورەی خۆی ئەنجام دەداو، ماڵی هیچ حزب و لایەنێك نەبوو لە کوردو ئامانجە پیرۆزەکانی بەولاوەو، مامەحەمەیی و مەرایی بۆ کەس نەدەکرد، دەزگای ڕاگەیاندنی هیچ حزبێکی ئەمڕۆی کوردستان مەرگی پڕ لە تراژیدیاو سەرنانەوەی نەوەکامی ئەم نووسەرو وەرگێڕە قەڵەم بە بڕشتەی بەسەر نەکردەوەو، هەرچۆن لە ژیانیدا کپ و هێمن بوو ئاوهاش بە کپی و بێدەنگی ڕۆژی 1993/9/5 بە دەردی دڵ بەجێی هێشتین و فرە ئاواتی بەدی نەهاتوو ژانی سەختی گەلە کڵۆڵ و گرفتارەکەی بردە گردی سەیوان، مامۆستا جەمال عەبدول، بە گەرمی شینی ئەم پیاوەی کرد، ئەویش نەك وەك وەزیفەی پارێزگار، بەڵکو وەك دۆستێکی نزیك و بەوەفای کاك جەلال.

**جەلال تەقیی نەمر.. خەرمان بەرەکەت لە بەرهەمی چاپ و دەسنووست**

مرۆڤ لە ئاست گەورەیی ئەو کارەی ئەم پیاوە کردوویەتی ناتوانێ بە قسە هەق بەو ڕەنجە بدات و گەشتێکی کورت بەنێو بەرهەمە چاپکراوە دەسنووسەکانیدا ڕادەی ئەو خزمەتە دەردەخا کە لە بوارە جۆراوجۆرەکانی مێژوو ئەدەب و فەرهەنگی گەلەکەیدا کردوویەتی:

# سەرەتایەك لە فەلسەفەی یۆنانی کۆن

زۆر لە مێژبوو حەزم ئەکرد دەربارەی سەرچاوە لەبن نەهاتوەکەی ڕۆشنبیری یۆنانی کۆن شتێك بخەمە بەرچاوی خوێنەری بەڕێزی کورد، بەڵام ئەو گەلە بچووکەی یۆنان، کە زیاتر لە دوو هەزار ساڵ لەمەوپێش خۆری زانیاریی و ئەدەب و فەلسەفەی جیهان ڕوناك کردۆتەوەو تیشکی بە هەموو لایەکدا پرژاندوە، هێندە گەوهەری خستۆتە سەر ملوانکەی ڕۆشنبیریی جیهان کە مرۆڤ نازانێ کام گەوهەری لێ هەڵبژێرێ و پێشکەش کتێبخانەی هەژاری کوردی بکا..

بەڵام لە دواییدا بڕیارم دا باشتر وایە ئەو بەرهەمەی کە پێشکەشی ئەکەم فرە لایەن بێ.. بۆ ئەمەش بەرهەمی ئەم سێ نووسەرە سۆڤیتیانەم هەڵبژارد کە پسپۆڕ و شارەزای فەلسەفەو زمان و ئەدەبی یۆنانین و وردەکاری زمانی یۆنانی بە شێوەیەکی زۆر نایاب ئەزانن.. بۆیە بەرهەمەکەیان، هەرچەندە بە ڕواڵەت باسی فەلسەفەی یۆنانی کۆنە، بەڵام لق و پۆپی لێبۆتەوەو لەم سنورە دەرچوە و باسی پوخت و بەپێزی ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و زۆر لایەنی تری ئەو سەردەمە ئەکا.. ئەوەی زیاتر وای لێکردم ئەم بەرهەمە هەڵبژێرم و بیکەم بە کوردی ئەوە بوو کە وەك زۆربەی ئەو کتێبانەی دەربارەی یۆنانی کۆن نوسراون تەنها پیاهەڵدان و مەدح کردن نیە، بەڵکو بە چاوێکی ڕەخنەسازیشەوە ڕوانیویانەتە فەلسەفەی یۆنانی کۆن و لە زۆر شوێندا کەم و کوڕی نوسەرە یۆنانییە کۆنەکانیان دەرخستوە. بۆ وێنە، هەرچەندە بە دەگمەن لە نوسراوێکی ئەم وڵاتانەی ئەم ناوچانەی خۆماندا ڕەخنەم لەم بارەیەوە لێگیراوە، ئەمان زۆر ئازایانە، بەڵام بە شێوەیەکی زانیاریی، ڕەخنەی تەواو هەتا لە بەرهەم و بۆچوونەکانی ئیفلاتون و ئەرستۆش ئەگرن کە لای زۆر کەس کفرە بەو دوو فەیلەسوفە بلیمەتانە بوترێ لەسەرچاویان برۆ هەیە! بەڵام ئەمان زۆر بە وردی و بێلایەنانە ئەم باسە ئەنجام ئەدەن و کەم و زۆر لەم ڕووەوە قەناعەتیش بە خوێنەر ئەکەن.

**خوێنەری هێژا!..**

لە هەڵبژاردنی ئەم بابەتەدا تووشی گەلێك ناڕەحەتی بووم، چونکە ڕەنگە زۆربەی ئەم بابەتانە بۆ زوربەی خوێنەری بەڕێزی




کوردی ئاسایی نەبن و نامۆ بن، بۆیە لە کاتی وەرگێڕاندا ئەبوایە وشەی وام هەڵبژاردایە کە زۆر ڕەق و ناڕەحەت نەبن و بە ئاسانی تێی بگەن.

هەروەها نەبوونی زاراوەی فەلسەفی لای خۆمان یان ڕاستتر کەمی زاراوەی فەلسەفی کۆسپێکی تری خستە بەردەمم و بە گران زاراوەی گونجاوم ئەدۆزییەوە، ئەویش دوای ماندووبوون. چونکە مەگەر تەنها زمانێکی دەوڵەمەندی وەك یۆنانی کۆن توانیبێتی خۆی لە قەرەی ئەو بابەتانە بداو بەو فراوانی و چڕییە بە ئاسانی ئەو زاراوە و وشانە تۆمار بکاو ئەمە لە توانای زۆر زمانی دەوڵەمەندی ئەوروپاشدا بە تەواوی نیە، بۆیە سەیر نیە کە هەتا ئێستاش زوربەی هەرە زۆری زاراوە زانیاری و فەلسەفییەکانی جیهان هەمیشە هەمان ئەو زاراوە یۆنانیانەن کە لە کاتی خۆی



نوسەرانی یۆنانی کۆن بەکاریان هێناوەو ڕەنگە زمانی هەمە ڕۆژەی زۆر کەس بووبێ لەو سەردەمەدا، بۆیە ئەگەر زمانی کوردی داماو لەم ڕووەوە کەموکوڕیشی تێدا بێ جێی نەنگی و شەرم نیە، چونکە زمانێکی بەرفراوانی پێشکەوتووی وەك زمانی ڕوسیش، کە بە پێی دوا سەرژمێری زمانەوانی، سەرجەمی وشەی زمانەکەیان لە ملیۆنێك وشە تێپەڕیون، بەڵام لە زۆر شوێندا لەم بەرهەمەدا لەبەر دەوڵەمەندی زمانی یۆنانیدا دەستەوەسانەو زۆرجار نوسەرانی ئەم بەرهەمەی بەردەستمان ناچار بوون لەپاڵ وشە ڕوسیەکاندا وشە یۆنانیەکانیش لە کەوانەدا بنوسن بۆ ئەوەی ئەگەر خوێنەرێکی ڕوسی یۆنانیزان مەبەستی بێ بتوانێ بگەڕێتەوە سەر ئەسڵەکەو بەراوردی بکا. بەڵام بە داخەوە من نەمتوانی ئەمە بکەم، چونکە زمانی یۆنانی نازانم و تەنیا ئەو چەند وشەو زاراوە ئەندازیاریانە ئەزانم کە لە کاتی خۆی لەوانە زانیارییەکانی زانکۆدا خوێندوومن. نەشمویست وەك هەندێ نوسەری بەڕێز بکەم کە زمانێکی بیانی نازانن بەڵام لە پەراوێزی بەرهەمەکانیاندا لیستەی کۆمەڵێك نوسراوی چەند زمانێکی بیانی ئەنوسن کە گوایە کەڵکیان لێوەرگرتون، بەڵام بە هیچ جۆرێك نازانن ئەو زمانانە بەری چ دارێکن.. بەڵکو ئەو زمانەش کە ئەیزانن بەسەرو گوێلاك شکاوی شتی لێوەرئەگێڕن!

شتێکی تریش.. ئەو کتێبەی ئەم چەند بابەتەم لێهەڵبژاردوەو وەرگێڕاوەو پێشکەش خوێنەری بەڕێزی ئەکەم، لە سێ بەرگی قەبارەی گەورەو بابەتی زۆر پێکهاتوە و لەلایەن ئەکادیمیای زانیاری سۆڤێتیەوە لە نێوان سالآنی 1946–1960دا لە مۆسکۆ چاپکراوە. بێگومان جێی شانازییە بۆ نوسەرەکانی کە دەزگایەکی گرنگی وەك ئەکادیمیای سۆڤێتی بۆی چاپ کردوون. ئەوەی پێشکەشی بەڕێزتانی ئەکەم، بەشێکی زۆر کەمە لەو بەرهەمە گەورەیە بەڵام بێ دەستکاری ئەو بەشە. هیوادارم کەڵکێکی کەمم گەیاندبێ‌و جێی ڕەزامەندی تۆی بەڕێز بێ –ئەی خوێنەری هێژا.

**خوێنەری بەڕێز!**

ئایا ئەو گەلە بچوکە مەزنەی یۆنانی کۆن کەی دەستی کردوە بە نوسین و لەسەر چی و بەچی نوسیویەتی؟..

بێگومان ئەبێ زۆر پێش ئەو نوسەرە بلیمەتانەی لەم کتێبەی بەردەستدا ناویان هاتوە نوسین لەو وڵاتەدا پەیدا بووبێ.. بۆیە بە پێویستم زانی زۆر بە کورتی لەم بارەیەوە شتێك بنوسم بۆ ئەوەی بەڕێزت ئاگاداری ئەم خاڵە گرنگە بی..

ئەم نوسینەم لە زۆر سەرچاوەوە هەڵهێنجاوە، بە تایبەتی لە نوسینێکی سۆبۆلێڤیسکیەوە کە لە باسێکی دورو درێژی (مێژووی ئەدەبی یۆنانی کۆن)دا تۆماری کردوە.

* * *

بە تەواوی نازانرێ گەلی یۆنانی کۆن لە کەیەوە نوسینی بەکارهێناوە[1] بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین کە هونەری نوسین لە زۆر کۆنەوە لە یۆناندا هەبوە.. گومان لەوەدا نیە کە بە هۆی پەیوەندی بازرگانی و هاتوچۆوە لەگەڵ فینیقیەی خاوەن نوسیندا جۆرە ئەلف و بێیەکیان لەوان وەرگرتوە و بەکاریانهێناوە.. بەڵام پێش ئەمەش یۆنانییەکان هونەری نوسینیان هەر زانیوە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕا بۆ ئەوە ئەچێ کە پێش ئەوەی بگەنە دورگەی کریت، نوسینیان نەزانیوە[2] ئەوەی شایانی باسە هۆمیرۆس لە ئەلیازەدا باسی ئەو "پارچە تەختە قەدکراوە" ئەکا کە لەسەریان نوسیوە[3].

هەتا ئێستا بە تەواوی ڕون نەبۆتەوە کەی ئەلف و بێ لە یۆنانی کۆندا پەیدا بوە. بەڵام زۆر ئاشکرایە کە لە سەدەی نۆیەمی (پ.ز)دا نوسیویانە و شوێنەواری نوسین ئەو سەردەمە ماوەتەوە. نیشانەو شوێنەواری نووسراوی پێش سەدەی نۆیەمی (پ.ز) بەرچاو ناکەوێ، هەندێ لە نوسەرە کۆنەکانی یۆنانی ڕایان وایە کە نووسین زۆر دوای ئەو کاتەی باسمان کرد بەکارهێنراوە. بۆ وێنە، یوسف فلاڤێتی: ئەڵێ کە یۆنان نوسراوی "ڕەسمی" پێش یاساکانی (دڕاکۆنت)ی نەبوە، واتا پێش ساڵی (621 پ.ز) یوسف ڤلاڤێتی: دژی ئاپیۆن، بەش1، پارچە4.

کۆنترین ئەو هەواڵانەی دەربارەی شوێنەواری نوسینی یۆنانی کۆن، لە نوسراوی نوسەرە کۆنەکاندا ماونەتەوە، ئەمانەن:

1–نوسینی سەربەرد، یان مەرمەڕ: بەڕای پسپۆڕان، نوسینەکانی فێراو میلۆس و نیتۆس کە ماونەتەوە لە سەردەمی دەورەی چلهەمی یارییەکانی ئۆلۆمپی کۆنترینیان (دەوروبەری ساڵی (620 پ.ز)[5] نوسینی سەر بەرپێی دوو پەیکەری یۆنانی کۆن، کە لە لایەن دیلە یۆنانییەکانەوە لە (نوبیا) ماونەتەوە ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شا (پسامێتیخ)ی یەکەم (635 پ.ز) یان سەردەمی شا (پسامێتخ)ی دوەم (590 پ.ز).

2–شوێنەواری نوسین کە لە لایەن نوسەرە کۆنەکانەوە باس کراون: بۆ وێنە، باسی سەرکەوتوانی یاری ئۆلۆمپی پاش ساڵانی (776 پ.ز) نوسراوە.. یان باسی هەواڵەکانی کاربەدەستانی ئەسپەرتە تۆمار کراوە ساڵی (755 پ.ز) و لەوە بەدواوە. هەروەها هەواڵە نوسراوەکانی زێوانەی پەرستگا بەناوبانگەکانی یۆنانی کۆن، وەك زێوانەی پەرستگای (گێرا) لە شاری (ئەرگۆس) و (پەسیدۆن) لە (هالیسکالیاس) بێجگە لەمانە، لە زوربەی شارەکاندا شوێنی (ئارشیف) و نوسراوی ڕەسمی هەبوون کە ناوی زێوانە و پیاوانی ئاینی و مۆسیقاژەن و هۆزانڤانەکانیان تۆمار کردبوو پەرستبوویان.

3–نوسراوی یاساو ڕێکەوتنەکان هیچیان لە یاسا نوسراوەکانی (زالێڤك)ی خەڵکی (لۆکری) پێنەگەیشتوە کە لە دەوروبەری ساڵی (664 پ.ز)دا نوسرابوون. بەڵام دەربارەی یاساکانی دراکۆنت (دەوروبەری 621 پ.ز) و یاساکانی سۆڵۆن (594 پ.ز) چەند پارچەیەکمان پێگەیشتوون[6] ئەوەی شایانی باسە، یاساکانی سۆڵۆن لەسەر تەختەی چوارگۆشە نوسرابوون و لە ئەسینا هەڵواسرابوون و نەفەوتاون.

نوسراوی ڕێکەوتننامەی (مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی) لە نێوان شاری ئێڤیای ئەرکادی و ئیلیدا ماوەتەوە کە هەندێ لە زانایان ئەیگێڕنەوە بۆ سەردەمی ئۆلۆمپیای ژمارە (50) واتا ساڵانی (580– 577 پ. ز) و هەندێکی تریش لەوە تازەتری دائەنێن. بەڵام پاڤانی ئەڵی کە بە چاوی خۆی ئەو تەختە پیرۆزەی بینیوە کە ئەو پەیمانی ئاشتیەی لەسەر نوسراوەو لە کاتی ئۆلۆمپیادا خوێنراوەتەوە و بە ناوی (ئیڤۆنت)ەوە ناسراوە. لەبەرئەوەی (ئیڤۆنت) هاودەمی (لیکۆرگ) و دامەزرێنەری یارییەکانی ئۆلۆمپی بوە -کەواتە ئەو نوسراوە ئەگەڕێتەوە بۆ (سەدەی هەشتەمی پ.ز).

بەڵام ئەو نوسینانەی لە سەرەوە باسمان کردن، ناتوانن ببنە مێژویەکی تەواوی ئەدەبی یۆنانی بەڵکو هەر دەنگوباسێکی ئەدەبین و هیچی تر نوسینی ڕاستەقینە لە یۆنانی کۆندا تەنها ئەوکاتە پەیدابوو کە کەرەستەی ئاسان دەستکەوت بۆ لەسەر نوسین بۆ ئەوەی بتوانرێ بەرهەمی درێژ و ژمارەیەکی زۆری لەسەر بنوسرێ، واتا ئەو کاتەی کە بۆ ئەم مەبەستە لە میسرەوە "بەڕەدا" هێنرایە یۆنان.

یەکەم هەواڵ دەربارەی بەکارهێنانی بەڕەدا لە یۆنان لەلایەن هیرۆدۆسەوە باسکراوە[7].. ڕا بۆ ئەوە ئەچێ کە لە سەدەی حەوتەمی (پ.ز)دا بەڕەدا لە یۆنان بە تەواوی بڵاوبووبوەوەو لەسەری نوسرابوو، بە تایبەتی لە سەردەمی شا (پسامێتخ)ی یەکەمدا (671–617 پ.ز) کە پەیوەندی بازرگانی و هاتوچۆ لە نێوان میسر و یۆناندا پەرەی سەند و هێنانی بەڕەدا بۆ یۆنان ئاسان بوو. لەبەرئەوەی بە ئاسانی لەسەری ئەنوسرا– بەڕەدا تەنگی بە کەرەستەی کۆن هەڵچنی وەك تەختە و بەرد و مس و هەتا سەدەی چوارەمی (پاش. ز) مایەوە.

کەواتە، ئەتوانین بڵێین بەرهەمی هۆزانڤانە یۆنانیەکانی سەدەی هەشتەم حەوتەمی (پ. ز) وەك هێسیۆد و ئارخیلۆخ و هی تر، کورت بوون و لەسەر مس و تەختە و چەرم نوسرابوون، یان دوور نیە هەر نەشیار نوسیبن..

خوێنەری بەڕێز!: ئەمە بوو زۆر بە کورتی باسێکی سەرپێیی پەیدابوونی نووسین لە یۆنانی کۆندا.. ئەگینا ئەگەر بمانەوێ بە درێژی لە هەموو لایەنەکانی ئەم باسە بکۆڵینەوە، زۆری ئەوێ و کورد واتەنی: ( **ئەم هەویرە زۆر ئاو ئەکێشێ!** )

**جەلال تەقی**

**سلێمانی- تشرینی دوەمی** 1990

**سەرچاوە: سەرەتایەك لە فەلسەفەی یۆنانی کۆن، نوسینی کۆمەڵێك زانای روسی، وەرگێڕان لە ڕووسییەوە، چاپی یەکەم، ساڵی 2000، لە بڵاوکراوەکانی چاپەمەنی زاموا، ( پێشەکی کتێبەکە ).**

**پەراوێزەکانی پێشەکی:**

1–سۆبۆلێڤسکی: مێژووی ئەدەبی یۆنانی، بەرگی دوەم، مۆسکۆ 1955، ل 8.

2–مێژووی ئەدەبەی یۆنانی کۆن، بەرگی یەکەم، مۆسکۆ، 1946، ل 156.

3–س. ی. لووریيا: بڵاوکراوەی (هەواڵی مێژووی کۆن، مۆسکۆ 1947، ژمارە 4، ل 79.

4–دراکۆنت (دراکۆن): یاساناسێکی خەڵکی ئەسینای سەدەی حەوتەمی (پ.ز) و بە (درندەو زۆردار) ناوی دەرکردبوو، ئەڵێن ئەم ناوبانگە خراپەی لەوەوە پەیدابوە کە کۆمەڵە یاسایەکی ڕەقی داناوە بۆ پاراستنی (سامانی کەسی) بۆ وێنە، سزای هەموو جۆرە دزی کردێکی -مردن بوە، بەبێ ئەوەی گوێی دابێتە کەم و زۆری ئەو دزییە!.

5–یارییەکانی ئۆلۆمپی: گرنگترین پێشبڕکێی یۆنانی کۆنە.. بەهەر چوار ساڵ جارێك لە (ئۆلۆمپیا) ساز ئەکراو لە زۆر کۆنەوە باو بوو، ئەڵێن لە دوو هەزار ساڵ پێش عیساوە هەبوە، بەڵام لە بیرچوو بوەوەو لە ساڵی (880 پ. ز)دا لە لایەن لیکورگەوە بوژێنرایەوە وەك پەیمانێکی ئاشتی لە نێوان شارە یۆنانییەکاندا کە دوژمنایەتییان لە نێواندا

# ئەو پیاوەی وێرای بپرسێ

ئاشکرایە کە دواکەوتنی کورد هەر لە باری کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە نیە بەڵکو لە هەموو ڕوویەکەوەیەو بە تایبەتی لە ویژەدا هەتا بڵێی لە کاروانی گەلان بەجێماوە. ئەمەش هەرچەندە هۆی زۆری تایبەتی خۆی هەیە لەگەڵ ئەوەشدا کەم سەلیقەیی و لەخۆنەبوردنی خۆمان دەورێکی باڵای لەمەدا هەبووەو لەمەودواش هەر دەبێ ئەگەر زوو فریای نەکەوین و چارێك بۆ پەرەوازەیی و گەڕەلاوژێی نوسراوی کوردی دانەنێین.

لەم ساڵانەی دواییەدا لە چاو ساڵانی پێشوودا ژمارەیەکی زۆر پەڕاو کەوتۆتە بازاڕەو لەوانەیە لەمەودا پتریش ببێ، بەڵام لە زوربەی ئەم پەڕاوانەدا دەردەکەوێ کە هێشتا پلەی نوسینی ئێمە کزە، لەمەش خراپتر ئەوەیە کە نامانەوێ دان بەمەدا بنێین و لە کتێبخانە دەوڵەمەندەو بەنرخەکانی جیهانی کۆن و تازەدا سەرچاوەی بەکەڵك بدۆزینەوە و کتێبخانەی کوردی پێ موتوربە بکەین.

کورد لەمەش چارەڕەش ترە. لەم دواییەدا نوسەرەکانمان دەستیان داوەتە وەرگێڕانی ئەو پەڕاوانەی لەسەر کورد بە زبانە بێگانەکان نوسراونەتەوە بەڵام نەك بۆ زمانی کوردی، بەڵکو بۆ زمانێکی تری بێگانە کە مەگەر هەر کوردەکە خۆی بەو زبانە بێگانەیەش بیخوێنێتەوە. ئەمەش گوایا بۆیە دەکەن کە کورد بە میللەتانی تر بناسن. ئەمە زۆر ڕاستە ئەگەر بەروبومی نوسەرانی کورد بە بێگانە بناسن. ئەگینا هەر بێگانەیەك بە ڕاستی بیەوێ باسی کورد بخوێنێتەوەو تێی بگات بە زمانەکانی تر دەتوانێ ئەمە بکات، یان هیچ نەبێ ئەو نوسراوانە لە پێشدا بە کوردەکە خۆی بناسرێ دوای ئەوەش وەربگێڕدرێتە سەر زمانەکانی تر.

ئەمەیە حاڵی کورد لە ناسینی خۆیدا. خۆ ئەو پەڕاوە مەزنانەی بوونەتە هۆی وریابوونەوەی ئەوروپاو هەموو جیهان ئەوە هەر باسی مەکە و بەم پێیە بڕۆین کورد هەرگیز بە خۆیەوە نابینێ لە سەرچاوە نایابەکانی ویژەی جیهان شتێك وەرگرێ، فەرموو ئەوە ئەرز و ئەوە گەز! ئەوە هەزارەها پەڕاوی نوسەرە بەرزەکانی وەك (سێرفانتیس)، (دانتێ)، (هۆگۆ)، (پوشکین)، (لێرمەنتۆڤ)، (هەمەنگوای)، (کالدوێڵ) و هتد..

کام یەکێك لەمانە ئەو کوردەی زمانێکی بێگانە نازانێ هەر ناوی بیستوون؟ ئەمە دەربارەی نوسەرە تازەکان و نوسەرانی سەدەی ناوەڕاست. خۆ پەڕاوی نوسەرە کۆنەکانی وەك (هۆمیرۆس)، (یورپیدین)، (سوفوکل)، (ئەریستۆفان)، (ئەریستۆتیل)، (دیمۆکریت)، (ئیسۆکرات)، (هیرۆدۆتس)، (پلوتارك)، (ئیفلاتون) و هتد.. ئەوە هەر باسیان مەکە، بێجگە لەوەی کە مامۆستا شاکیر فەتاح لە ساڵی (1968)دا دەربارەی دادگاکەی سوقرات، چاپی کرد و مامۆستا (حەسەن فەهمی جاف) پەڕاوە نایابەکەی گەزەنەفونی لە ساڵی 1961دا خستە بەرچاو و ناوبەناو مامۆستا علاءالدین سجادی لە (مێژووی ئەدەبی کوردیدا) باسی هەندێ نوسەری کۆنی یۆنانی کردوە دەڵێم بێجگە لەمانە دەربارەی ئەو سەرچاوە وشك نەبوە یۆنانیەی کە هەموو مرۆڤایەتی قەرزاریەتی کورد مەگەر هەر ئەوەندەی ئاگا لێبێ کە دایك و باوکمان پێیان وتبین!

"ئەڵێی ئیفلاتونی حەکیمە"، یان "ئەرستۆیەکە بۆ خۆی".

—لێرەدا مەبەستم لەو کوردانەیە کە زمانێکی بێگانە نازانن—

ئینجا ئەمە باری خوێندەوارانی کوردبێ زۆر بە تاوانی دەزانم لەم کاتە ناسکەی گەلەکەماندا خۆمان بە پەڕاوی بێکەڵکی واوە، خەریك بکەین کە نەوەك هەر پێشمان ناخات بەڵکو ویژەکەمان بەرەو دواوە دەباتەوە. بۆیە بە بیروڕای من باشتر وایە کە دەستبکەین بە وەرگێڕانی پەڕاوە جیهانیە بەنرخەکان.

ئەم پەڕاوەی کە پێشکەشتی‌دەکەم، ئەی خوێندەواری خۆشەویست، هەرچەندە نوسراوێکی تازەیە، لەگەڵ ئەوەشدا باسێکی زۆر کۆنە و زۆر شتمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. دکتۆرە (کۆڕا مێسن)ی ئەمەریکی بە شێوەیەکی ئاسان و نزیك لە چیرۆکەوە ژیانی پێش بیست و چوار سەدەمان بۆ دەگێڕێتەوە، لەم پەڕاوەدا زوربەی بیروڕاو نوسینەکانی (ئیفلاتون) و (زینۆفۆن)مان بۆ ڕون دەکاتەوە بێئەوەی شێوە وشك و برنگەکەی ئیفلاتونمان بەسەردا بسەپێنێ. ویستم بە پەڕاوێکی کۆنی ئیفلاتون دەست پێبکەم، بەڵام کە لێکمدایەوە زوربەی ئەو پەڕاوە کۆنانە شێوەیەکی نارەحەتیان هەیە لەبەرئەوە ئەمەم هەڵبژارد کە شتێکی کۆنە لە بەرگێکی تازەدا.

هەرچەندە، ئەی خوێنەواری بەڕێز، باسی بیست و چوار سەدە لەمەوبەرت ئەخەمە پێشچاو بەڵام زوربەی ئەو باسانەی

ئەیخوێنیتەوە دەڵێی بۆ ئەمڕۆی ئێمە وتراوە، هەر بە تەنها باسی سوقرات ناخوێنیتەوە، بەڵکو فیلمێکی گۆڕینی مرۆڤایەتی دێتە بەرچاوت، بەراوردێکی ئێستای هەر شارێکی کوردەواری بکە لەگەڵ ژیانی پێش بیست و چوار سەدەی شاری "ئەسینای" یۆنانیدا، پاش تەواوبوونی شەڕی نێوانی (ئەسپەرتیەکان) و (ئەسینیەکان) بە چوار ساڵ، ئایا زۆر لەوە ناچی کە باسێکی ئێستای شارەکانی ئێمە بکرێ.

"لە ڕاستیدا وا بە ئاسانی شەڕی ناوخۆیی لە مێشکی خەڵکدا دەرنەدەچوو، هەموو شتێك نەگەڕابوەوە دۆخی پێش جەنگ، زۆر خێزان پەرشوبڵاو بووبوونەوە، زۆر کەس داوای وەرگرتنەوەی زەوی و زار و سامانی خۆیان دەکردەوە، کەسوکار کوژراو داوای تۆڵەیان دەکرد و خەڵك ناسۆر و پەستی دایگرتبوون. ئەوەبوو نیوەی خەڵکی شار لە تاوانی (ئەنجومەنی سی کەسەکە)دا بەشداریان کردبوو، نیوەکەی تر بە دەستیانەوە تووشی سزاکێشان بووبوون. ئینجا ئەگەر ئەم دوو تاقمە هەوڵی ئەوە نەدەن پێکەوە بگونجێن وا شارەکەیان سەری تیادەچێ، بۆیە خەڵك زۆر هەوڵی دەدا هەلی تێکچوونەوەی ئاشتی نەیەتەوە کایە، هەروەها فەرمانڕەوا دیموکراتیە دڵسۆزەکانیش پاش گەڕانەوەیان بۆ سەر فەرمان هەوڵی ئەمەیان دەدا، ژیرانە لەگەڵ ئەسپەرتیەکاندا دەدوان و بۆ بەرژەوەندی گشتی وازیان لە چاکەی خۆیان دەهێنا.. (ئەنجومەنە بچوکەکەش) فەرمانی مردنی بەسەر یەکەم کەسدا دا کە ئەو سوێندەی شکاند کە بۆ لەبیرچوونەوەی ئازاری ڕابوردوو خواردبووی و یەکسەر فەرمانەکە بەجێهێنرا.. لەگەڵ ئەوەشدا "نەفسیەتی" زۆر کەس دەرکەوت.. هتد..".

ئەمە دەربارەی ژیانی شاری پاش شەڕ. لە باسی دوژمنانی یاسادا ئەم وشانەیان دەخوێنینەوە:

"ئەو کردەوە و یاسا کۆنانەی دەربارەی هەق و ناهەق باون چەند پیاوێکی ترسنۆك دایان ناون و پێویست ناکات خۆمانی پێوە ببەستینەوە. یاسای سروشت ئەوەیە کە دڕندەکان بەجێی دەهێنن: خۆت ڕزگار کەو چیت ئەوێ بۆ خۆتی بەرە".

بەم جۆرە لە یۆنانی کۆندا باسی هەق و ناهەق و یاسا ئەکرا. لە زانیاریشدا گەیشتبوونە پلەیەکی زۆر بەرز. لە باسی گەردوندا "ئەنکسگۆراس" کە بە (خوانەناس) تاوانبار کراو خەریك بوو سەری تێدا بچێ دەڵێ "مانگ لە خۆڵ و گڵ پێکهاتوە و تیشکی تایبەتی خۆی نیە بەڵکو تیشکی ڕۆژ دەداتەوە. شاخ و دۆڵ و گردی تێدایەو لەوانەیە گیان لەبەریشی لەسەر بژی.".

سەیریش ئەوەیە لە کاتێکدا کە هەموو ڕۆژیان بەخوا دەزانی هەمان ئەنکسگۆراس دەیوێرا بڵێ: "ڕۆژ خوا نیە بەڵکو مەعدەنێکی گەورەی تیشکهاوێژە". هەر ئەم قسانەش بوو کە ڕەوانەی دادگایان کرد و خەریك بوو گیانی لەسەر دانێ.

شتێکی تریش بوە هۆی ئەوەی ئەم پیاوە ناوی "کافر"ی بەسەرا بسەپێنرێت ئەویش باسی ئەو "بەردە ڕەشە بوو کە لە ئاسمانەوە کەوتبوە خوارەوەو خەڵك ئەیانوت خوا فڕێی داوەتە خوارێ".. بەڵام ئەو ئەیوت: "خوا فڕێی نەداوە و ئەبێ ئاسمان بەردی تێدابێ".

لەگەڵ ئەوەشدا زۆر جار درۆ بە دەم خواوە دەکرا و دەوترا کە ئەو هۆی ئاژاوەو خراپەیە. بەڵام سوقرات بە خەڵکی ڕاگەیاند کە "خوا مرۆڤ بەرەو ڕێی ڕاست ئەبات و لەسەر مرۆڤ پێویستە گوێڕایەڵی بێ.." هەروەها دەریشی خست کە "خوا بە بەزەییە، هەموو ڕەوشتێکی چاکەی هەیەو لە چاکەش پتری ناوێ بۆ مرۆڤ..".

ئا بەم جۆرە ئەوسا لەم شتانە دەدوان. دەتوانین لەم پەڕاوەدا زۆر شتی وا بخوێنینەوە کە هەتا ئێستاش لای ئێمە تازەیەو زۆر شتی وای تێدایە کە شایانی خوێندنەوە بێ. لەبەر ئەوە، ئەی خوێندەواری بەڕێز، بە وردی بیخوێنەرەوە، ئەگەر چاك بوو وا سوپاسی ئیفلاتۆن و سوقرات و کۆرامێسن بکەو ئەگەر خراپیش بوو وا یەخەی من بگرە چونکەی لەوانەیە من نەمتوانیبێ بیخەمە قاڵبێکی واوە کە بە دڵت بێ هەرچەندەش بە پێی توانا هەوڵم داوە بە شێوەیەکی ئاسان مەبەستەکان بخەمە بەرچاو. سا ئیتر لە من ماندووبوون و لە ئێوە پشتگیری بۆ بەرهەمی داهاتووی لەم چەشنە.



دوا تکاشم ئەوەیە بە چاوی لێبوردن سەیری ئەم وەرگێڕانە بکەن، چونکە بێجگە لەم سەرەتایەو چەند پەراوێزێکی نەبێ ئەوی تری پێش پتر لە دە ساڵ لە عەرەبیەوە وەرگێڕراوە کە هێشتا قوتابی بووم و بەبێ دەستکاری خراوەتە بەرچاوتان، دەستکاری تازەم بە پێویست نەزانی چونکە ویستم ببێتە نمونەی نوسینی ئەوسا بە تایبەتی کە نوسین بەپێی کات نرخی خۆی هەیە.

**جەلال تەقی**

**بەغدا- تەموزی** 1970

سەرچاوە: ئەو پیاوەی وێرای بپرسێ، نووسینی کۆراسن، وەرگێڕان لە عەرەبییەوە، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی، 1973 (پێشەکی کتێبەکە)

# شەوانی

# گوێ ئاگردان



که له ساڵی 1984دا بەرگی یەکەمی "شەوانی گوێ ئاگردان هەبوو.. نەبوو.."م چاپ کرد، هەندێ لە برادەرە نزیکەکانم وتیان بە خۆڕایی پارەیەکی زۆر لەو کارەدا بەفیڕۆ دەدەم.. وە وتیان کە ئێستا سەردەمی ئەم چەشنە چیرۆکانە نیەو بابەتی تر لە ئارادایە.. بەڵام من ڕام زۆر لەمە جیاواز بوو، وەك لە لاپەڕە (6)ی بەرهەمی ناوبراودا نوسیبووم، ڕام وابوو کە: "ئەگەر لە ڕابوردوی زۆر دووردا چیرۆکی ئەفسانەیی لەناو گەلاندا نەبوایە ئێستا نەدەتوانرا نهێنی ئاسمان و گەردون ئاشکرا بکرێت.. ئەو چیرۆکانەی کە مردنیان بۆ نیەو لە هەموو بەرهەمێکی تر پتر بەرگەی کۆسپی ئەم گەردونە دەگرن.."[1].

بەڵێ.. بڕوام بە نەمری ئەو چیرۆکە ئەفسانەییانە هەبوو، وەك چۆن بڕوام بە نەمری هەموو بەرهەمێکی فۆلکلۆری گەلەکەمان هەیە، وە بەرگی یەکەمم خستە ژێر چاپەوە.. و لە (229) لاپەڕەی قەوارە گەورەدا بە شێوەیەکی زۆر ڕازاوەو بێ هەڵەیەکی ئەوتۆ کەوتە بازاڕەوە..، هونەرمەندی ناسراو، هاوڕێی دێرینی ساڵانی هەندەران و هەمیشەم، مامۆستا محەمەد عارف هونەرێکی نایابی نواند لە ڕازاندنەوەی بەرگەکەیداو نەخشاندنی بەمە ڕەونەقێکی سەرنج ڕاکێشەری دایە.. هەندێك لە کارمەندانی چاپخانەکەش زەحمەتێکی زۆریان کێشاوە بە تایبەتی کاك سالار محەمەد ئەحمەد کە بەبێ هەڵە پیتەکانی داڕشتن و بەرهەمەکەی بەمە ڕازاندەوە، جێی سوپاس و نەوازشی هەمیشەیین.. وتم، هەندێك لە کارمەندانی چاپخانە.. چونکە "هەندێك"ی تر بە پێچەوانەی ئەمەوە ڕەفتاریان کرد و ناوی کەسیش ناهێنم، چونکە نیازی ناوزڕاندنی کەسم نیە، بەڵام هەر بۆ مێژوو یەك شت تۆمار دەکەم.. کەحیسابی پارەکەیان کرد، بۆ سێ هەزار دانە، (2008) دوو هەزار و هەشت دیناری تێچووبوو کە بۆ ئەو کاتە پارەیەکی کەم نەبوو.. هاوڕێیەکی ترم لەوێ کاری دەکرد کە لە سەردەمی حوجرەی مزگەوتی (موفق)یەوە کەسوکارمان تێکەڵاون و لەگەڕەکێکدا دەژیاین.. چاودێریم دەکرد کە ببێتە پاڵپشتم بۆ ئەوەی کتێبەکە زوو ڕزگاری بێ.. چاپخانەکە کە جاران سەر بە زانکۆی سلێمانی بوو –هێشتا لە سلێمانی مابوو و نەگوێزرابووەوە.. خەریکی هەڵوەشاندنی پارچەی هەندێکیان بوون کە ئەویش بگوێزنەوە بۆ هەولێر و پەلەم بوو کتێبەکە دەربچێ و ڕزگاری بێ.. ئەو برادەرە زۆر کۆن و نازدارەم بە چرپە پێی وتم: "بەڵکو شتێك بدەی بە کاك.. با پێش گواستنەوەی چاپخانەکە، ڕزگارت بێ..".

نایشارمەوە، ئەم داواکردنە وەك گورزەکانی چیرۆکە ئەفسانەییەکانی لە پشتم درا، نەك لەبەر ئەو داواکارییە، بەڵکو لەبەرئەوەی داواکە لەو برادەرەمەوە بوو.. حەپەسام.. باوەڕم نەکرد، نەخێر، بینیم بە ڕاستیەتی و دووبارەی کردەوە.. لێم پرسی: "ئاخر کاکی برا، خۆ

من كاسبیەكی گەورە ناكەم و هەزارەها دینارم دەست ناكەوێ هەتا داوای شتم لێبكەن.. لە خۆم گێڕاوەتەوە هەندێك پارەم پاشەكەوت كردوە بۆ ئەم كتێبە، ئیتر ئەمە یانی چی؟.."

وتی: "بەخوا ئارەزوی خۆتە، وەما عەلاڕەسول، ئیلالبەلاغولمبین!" وتم: "بە ئایەتی قورئانیش قسە ئەكەی؟.." چەند ڕۆژێك بێدەنگیم لێكرد، سەیرم كرد بەرگی كتێبەكە چەقی و كاری تێدا وەستا.. دووبارە پێی وتمەوە.. دووبارە گلەییم لێكردەوە، دووبارە كتێبەكە چەقیەوەو وەستا.. كە زانیم حاڵ وایەو چاپخانەكەش خەریكە ئەگوێزرێتەوە و لە سلێمانی دەربچێ ئیتر كتێبەكە سەری تێدا ئەچێ وتم: "چیتان ئەوێ؟.." وتی: "جوتێك كلاش!" ئەوكات جوتێك كلاش بە چل دینار بوو، كڕینی ئاسان نەبوو.. وتم: "ژمارە چەند؟" وتی: "بەیانی پێت ئەڵێم!" زانیم ئەم دواخستنە شتێكی تێدایە.. ڕۆژی دوایی وتی: "بەخوا دەستێكیش ڕانگ و چۆغەیان ئەوێ!" دەستێك ڕانك و چۆغە ئەو كاتە بە شەست دینار بوو.. پارەیەكی زۆر بوو.. حەپەسامەوەو گلەییم كردەوە، بەلام كەڵكی نەبوو.. وتم: "ئیتر شتی تر داواناكەن؟.." وتی: "نەء بە ناموسم، هیچی تریان ناوێ.. بەیانی بە یەكەوە دەچین و ڕەنگێكی جوان هەڵئەبژێرین.." بەڵێ، بەیانی سەد دینارم خستە گیرفانمەوەو چوومەوە "خزمەتی!" وتی: "ڕایان گۆڕیوە.. شتێك پارەیان بدەرێ باشترە!.." ئەم جارەیان توڕە بووم.. چەند قسەیەكی مزرم پێوت، نیوەی بە ناوی برادەریی و نیوەی بە ڕاستی، بەلام لە بزەو زەردەخەنە بەولاوە وەرامی نەبوو، وتی: "من بۆ خۆتمە.. بەیانی مەكینەی بەرگ چاپ كردنەكە هەڵدەوەشێنن و دەیبەن بۆ هەولێر!" وتم: "ئەمە هەڕەشەیە؟" وتی: "نەء، بەلام حەزناكەم كتێبەكەت دوابكەوێ.." وتم: "چەندت ئەوێ؟.." وتی: "عەیبە، بۆچی وا ئەزانی بۆ خۆمە؟.." وتم: "ئەگەر بۆ خۆت نیە، پێم بڵێ بۆ كێیە، ئەیدەم بە خۆی!" وتی: "نابێ.." وەلحاسڵ، داوای (600) دیناری كرد، وتم: "بەزاتی خوا، هەر دانێكت ئەوەندەی.. بێتە دەرەوە، ئەمەندەت نادەمێ، بۆچی كتێب قازانج ئەكا هەتا شەش سەد دینار بدەم بە تۆ؟" هەمدیسان وشەی "تۆ" توڕەی كردو وتی كە بۆ خۆی نیە.. لە كورتی بیبڕێنەوە، ڕۆژی دوایی دوو سەد دینارم بۆ خستە زەرفێكەوە بە ناچاری بۆم برد.. وتیشم: "بەمە قایلیت، باشە، قایل نیت نە كتێبم دەوێتەوەو نە دێم بە لاتانداو بە لەعنەتی خودابن!.." بەم جۆرە (2208) دوو هەزار و دوو سەدو هەشت دیناری تێچوو بێجگە لە كلێشەو هاتوچۆی "نیقابە" و كەباب كڕین بۆ هەموو (43) كاركەرەكانی چاپخانە.. لەبەرئەوە ناچار بووم لە ترسی نەفرۆشتنی هەموو دانەكانی نرخی (2) دوو دینارم لەسەر دانا كە بۆ ئەو كتێبەو ئەو كاغەزە سپیە بۆ ئەوسا زۆر نەبوو.. بە خواو ڕاستان، هەركە كتێب كەوتە بازاڕەوە، بە جۆرێك خوێنەران سەریان تێكرد و فرۆشرا، لە ماوەیەكی كەمدا دانەی نەماو قازانجێكی باشیشی كرد و هەتا ئێستا كتێبخانەكان داوای دەكەن..

ئەمە بوو كورتەیەكی چاپكردنی بەرگی یەكەمی ئەم كتێبە كە هەر بۆ مێژوو بە پێویستم زانی باسی بكەم..









سەرچاوە: شەوانی گوێ ئاگردان، بەشی یەكەم، كۆدرنەوەو ئامادەكردن و داڕشتنەوەی جەلال تەقی، چاپی یەككەم، 1984.

چیرۆك

# بەدبەختی بێمێشك

ئەگێڕنەوە ئەڵێن.. هەبوو.. نەبوو.. کەس لە خوا گەورەتر نەبوو.. کەس لە بەندەی خراپ ڕوڕەشتر نەبوو.. کەس لە بێ مێشك و نەزان بەدبەختر نەبوو، لەو گوندەی ئەو بنارە پیاوێك هەبوو، بەختی نەیئەهێنا، هەر کارێکی ئەکرد تیایدا سەرنەدەکەوت.. تۆوی ئەچاند، باران ئەیشتەوەو ئەیبرد.. ئاژەڵی لەئەوەڕاند، گورگی لێی ئەدان و ئەیخواردن، مریشکی بەخێوئەکرد، دەردە مریشك لێی دەدان و مرداری دەکردنەوە، بە کورتی بەدبەختی شانی گرتبوو لێی نەئەبوەوە، هەرچەند خۆی ئەیوت بەدبەختە، بەڵام لە ڕاستیدا هێندە گێل و نەفام بوو هیچی بۆ نەئەهات.. هەتا ڕۆژێك چوو بۆ لای مەلایەك کتێبێکی بۆ بگرێتەوە بزانێ بۆچی وایە.. مەلای زۆرزان لە قسەکانیدا بۆی دەرکەوت کە تاوانی بەخت نیە، بەڵکو تاوانی خۆیەتی، بەڵام پێی وت: "کاکی برا.. بەختی تۆ نوستوە، هەتا خەبەری نەکەیتەوە هەر ئەمە بەشت ئەبێ!.."

لێی پرسی: "ئنجا چی بکەم باشە؟"

—"بڕۆ بە شوێنیدا بگەڕێ هەتا ئەیدۆزینەوە، ئەوسا خەبەری بکەرەوە، ئیتر هەموو شتێکت بە ئاسانی بۆ ئەکرێ!"

کابرای گێل باوەڕی کرد، کاڵەو پێتاوی لەپێ کردو لێی دا ڕۆیشت.. کەم ڕۆیشت.. زۆر ڕۆیشت، ئەوە هەر خوا ئەیزانێ. کە گەیشتە دارستانێك بینی نەرە شێرێك لێی پاڵ کەوتوە.

شێرەکە لێ پرسی:

—"ها برا ئەوە ئۆغر بێ؟"

وەرامی دایەوە: "ئەچم بۆ لای بەختەکەم. بزانم بەڵکو خەبەری بکەمەوەو لەم بەدبەختی و کلۆلیە ڕزگارم ببێ".

شێرەکە وتی:

—"بە خوا برا منیش ڕاسپاردەیەکم هەیە.. ئەگەر بەختەکەی خۆتت دۆزیەوە، لێی بپرسە بزانە هۆی چیە چەند ساڵێکە توشی گێژیی بووم و هەمیشە سەرە خولەمە!.. بشزانە ئاخۆ چارەیەکم بۆ نادۆزێتەوە؟.."

شێرەکەی بەجێهێشت و ڕۆیشت.. کەم ڕۆیشت، زۆر ڕۆیشت، ئەوە هەر خوا ئەیزانێ.. گەیشتە سەر کانی و ئاوێك. لایداو ئاوی خواردەوەو دانیشت کەمێك بحەسێتەوە.. لەپڕ ماسیەکی گەورە سەری لە ئاوەکە دەرهێناو وتی:

—"ها برا.. ئەوە ئۆغر بێ؟.."

وەرامی دایەوە:

—"بەخوا برا ئەچم بۆ لای بەختەکەم،



بەڵکو خەبەری بکەمەوە و لەم بەدبەختیە ڕزگارم ببێ!.."

ماسییەکە وتی:

—"برا دەستم بە دامێنت، منیش ڕاسپاردەیەکم هەیە.. ئەگەر بەختەکەی خۆتت دۆزییەوە لێی بپرسە بۆچی هەمیشە دەنگم نوساوە و خواردنم باش بۆ ناخورێ؟.."

وتی: "باشە، بەسەرچاو!.."

کانی و ئاوی ماسییەکەی بەجێهێشت و ڕۆیشت.. زۆر ڕۆیشت، کەم ڕۆیشت، ئەوە هەر خوا ئەیزانێ.. گەیشتە لای باخێك.. باخەوانەکە لێی پرسی: —"ها برا، ئۆغر بێ؟".

وەرامی دایەوە:

—"بە خوا برا، چی بێ لە تۆ نهێنی بێ ئەچم بۆ لای بەختەکەم، دەمێ ساڵە نوستوە، بەڵکو خەبەری بکەمەوە و بەدبەختی لە کۆڵم بێتەوە".

باخەوانەکە وتی:

—"بە قوربانت بم منیش ڕاسپاردەیەکم هەیە.. ئەگەر خەبەرت کردەوە لێی بپرسە، بزانە بۆچی ئەو دوو دارگوێزەم پازدە بیست ساڵە باوکی ڕەحمەتیم ڕواندوونی هەتا ئێستا بەریان نەگرتوە و زیادیش ناکەن؟..".

وتی: "بەسەرچاو.. خوا ئەکا ئەیدۆزمەوە و خەبەری ئەکەمەوە لێی ئەپرسم!"

بەخەوانەکەی بەجێهێشت و ڕۆیشت.. زۆر ڕۆیشت، کەم ڕۆیشت، هەرخوا ئەیزانێ.. گەیشتە بیابانێکی کاکی بە کاکی، لەپڕ خدری زیندەی لێ پەیداوو—

ڕوحم بە قوربانی بێ و خێرو بەرەکەتی حازربێ– پێی وت:

–"برای بەدبەخت، ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟.."

وەرامی دایەوە: "کە ئەزانی بەدبەختم، دیارە ئەشزانی بۆ کوێ ئەچم".

وتی: "بەڵێ ئەزانم، بەدووی بەختەکەتدا وێڵی.. من بەختەکەی تۆم!.. بڵێ بزانم چیت ئەوێ؟".

کابرا لە خۆشیدا خەریك بوو شامەرگ بێ.. پێی وت:

–"دەخیلتم، مادام بەختی منی، لە خەو خەبەرت بێتەوە بگەرە فریام.. تۆ چەند ساڵە نوستوی و کولۆڵی شانم بەرنادا.. خوا هەڵناگرێ هەستە لە خەو!.."

خدری زیندە فەرمووی: "دە برۆ خوات لەگەڵ، وا لە خەو هەستاوم و ئیتر نانومەوە!.."

لە خۆشیدا خەریك بوو ڕاسپاردەکانیشی لەبیربچێتەوە، بەڵام باش بوو خواو ڕاستان، هاتنەوە بیری و هەمووی بۆ خدری زیندەی گێڕایەوە، فەرمووی:

–"بە باخەوانەکە بڵێ، هەر داگوێزەی کوپەڵەیەکی پڕ لە زێڕی لە بندایە، ڕەگەکان گەیشتوونەتە ئەو کوپەڵەیە، بۆیە زیاد ناکەن و بەرناگرن.. با بنیان بداتەوەو کوپەڵە زێڕەکان دەربهێنێ، ئەوسا زیادیش ئەکەن و بەریش ئەگرن".

وتی: "ئەی ماسییەکە چارەی دەردەکەی چیە؟.."

وەرامی دایەوە: "گەوهەرێکی گەورەی لە قورگ گیراوە، دەستی پێدا بکەو بۆی دەربهێنە، چاك ئەبێتەوە".

لێی پرسی: "ئەی گێژیی شێرەکە بەچی چاك ئەبێتەوە؟".

وەرامی دایەوە: "ئەمەیان زۆر ئاسانە.. مێشکی ئادەمیزادێکی کەر و بێئەقڵ بخوات یەکسەر چاك ئەبێتەوە".

کە ئەمانەی هەموو بیست، دەستی هەڵبڕی بۆ ئاسمان و سوپاسی خوای کرد کە ئاواتی هاتەدی و بەختی خەبەری بووەوە، کە سەری نزم کردەوە، خدری زیندە نەمابوو..

بە پەلە گەڕایەوە، کە گەیشتە لای باخەوانەکە و باسەکەی بۆ گێڕایەوە وتی:

–"بە قوربانت بم، یارمەتیم بدە، بە تەنها بۆم ناکرێ.. پاداشتت ئەدەمەوە.."

بە هەردووکیان دەستیان کرد بە هەڵکەندنی بن دار گوێزەکان.

دوو کوپەڵەی پڕ لە زێڕیان لە بندا دۆزیەوە.. باخەوانەکە پێی وت: "برا، من ئەمە لە چاوی تۆ ئەناسم.. کوپەڵەیەکیان بۆ تۆ و یەکێکیشیان بۆ من..".

کابرا ڕەتی کردەوە و وتی:

–(برا، من مادام بەختەکەم لە خەو خەبەری بۆتەوە، ئیتر کوپەڵە زێڕی تۆم ناوێ "لێیدا ڕۆیشت..".

بەم جۆرە دەستی نا بەخێری خۆیەوە ئەو سامانەی خوا دابوویە بە حەڵاڵی و بە ئاسانی ڕەتی کردەوە و ڕۆیشت. هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتەوە سەر کانی و ئاوەکە، ماسیەکە سەری هێنایە دەرەوە و وتی:

-"ها برا، بەختەکەت دۆزیەوە؟"

–"ئەرێ بە خوا دۆزیمەوە و خەبەرم کردەوە، ڕاسپاردەکەی تۆشم گەیاند.. گەوهەرێکی بەنرخ لە قوڕقوڕاگەتدایە بۆیە توشی ئەو دەردەسەریە بووی.. بێنە بۆت دەربهێنم!..".

ماسیەکە دەمی کردەوە، کابرا بە شێنەیی دەستی برد گەوهەرێکی لە قورگی دەرهێناو یەکسەر پشویەکی شادمانی داو پێی وت:

–"دەك برا سەرفراز بی.. گەوهەرەکە بەرە بۆ خۆت، بەشی هەموو ژیانت ئەکا!".

کابرا بە پێکەنینەوە وتی:

–"من گەوهەری تۆم ناوێ.. مادام بەختم لە خەو هەستاوە پێویستم بە گەوهەری تۆ نیە..".

ئەمەی وت و هەتا هێزی تێدابوو گەوهەرەکەی تورِ هەڵدا.." لێی دا ڕۆیشت.

هەر ڕۆیشت، هەر ڕۆیشت، هەتا گەیشتەوە لای شێرەکە.

لێی پرسی:

–"ها مامە گیان، بەخێربێیتەوە، بەختی خۆتت دۆزیەوە؟"

–"ئەرێ وەڵا دۆزیمەوە و خەبەرم کردەوە، ڕاسپاردەکەی تۆشم گەیاند.. وتی ئەمە زۆر ئاسانە، مێشکی ئادەمیزادێکی کەر و بێئەقڵ بخوا یەکسەر چاك ئەبێتەوە".

شێرەکی وتی: "ئنجا ئادەمیزادێکی وا لە کوێ بهێنم؟.."

دوایی لێی پرسی: "ئا توخوا بۆم باس بکە بزانم چۆن ڕۆیشتی، چیت کرد، چیت بەسەرهات؟ چۆن گەڕایتەوە؟.."

کابرا لە نوکەوە هەمووی بۆ گێڕایەوە.. چۆن باخەوانەکەی بینی، ماسیەکە چی پێ وت، خدری زیندە چۆن وتی من بەختی تۆم و وەرامی ڕاسپاردەکانی چۆن دایەوە، چۆن کوڵە زێڕەکەی ڕەت کردەوەو چۆن گەوهەری قورگی ماسییەکەی فڕێدا.. شێرەکە پێی وت:

–"بەخوا برا لە تۆ کەر و بێئەقڵترم دەستناکەوێ، کەواتە تۆ دەرمانی دەردی منی!.."

ئەمەی وت و چنگێکی پۆڵایینی تێسرەواند و گیانی دەرکردو مێشکەکەی خواردو یەکسەر دەردی تیماربوو..

منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ!..

**سەرچاوە:**

شەوانی گوێ ئاگردان "بەشی دووەم"، چاپی یەکەم 1998، لە بڵاوکراوەکانی چاپەمەنی زاموا.

**شانۆنامە**

# سالۆمی

**نوسینی: ئۆسکار وایلد**
**و. لە عەرەبییەوە: جەلال تەقی**

بەشدارەکانی ئەم چیرۆکەهیرۆدۆس: کوێخای وڵاتی جولەکە.

یۆحەنای مەعمەدان: ئەو پێغەمبەرەی نوقلانەی پەیدابوونی عیسای لێدا.

لاوە سوریەکە: فەرماندەی پاسەوانەکان.

لاوە نۆبییەکە:

ئابادۆکی: ڕۆمانیەکە.

هیرۆدیا: ژنی کویخا

سالۆمی: کچی هیرۆدیا

نەعمان: سەربڕ

نۆکەری هیرۆدیا: کەنیزەکی سالۆمی،

چەند سەربازێك، چەند قولێك، چەند جولەکەیەك، چەند نەسرانیەك

"پەردە"

چەند سەربازێك لەسەر هەیوانی تەلارە فراوانەکەی هیرۆدۆس دانیشتون و ڕادەبوێرن لەبەر شەوقی مانگەشەو. لای ڕاستەوە پەیژەیەکی گەورەو لای چەپییەوە – لە پشتەوە– حەوزێکی گەورەی قوڵی کۆن هەیە، دیوارێکی برۆنزی سەوزکاری بەدواوەیە.

لاوە سوریەکە: ئەمشەو شا کچ سالۆمی چەند جوانە!

نۆکەری هیرۆدیا: سەیری مانگ کە! چەند سەیرە! لە ژنێکی لەگۆڕ دەرهاتوو دەچێت.. وەك ژنێکی مردوو وایە، مرۆڤ وا دەزانێ لە مردوان دەگەڕێ!

لاوە سوریەکە: ڕاستە سەیرە! وەك شاکچێکی بچووك وایە کە پەچەیەکی زەردو دوو قاچی زیوی پێوەبێ وەك شاکچێکی جووتە پێ کۆتر وایە.. واش دەزانی سەما دەکات.

نۆکەری هیرۆدیا: وەك ژنێکی بێگیان وایە.. لەسەر خۆش دەجولێ!

"گوێی لە بۆڵەو خورتە دەبێ لە ژوورەکانی ناوەوە".

سەربازی یەکەم: ئەم دڕندانە کێن وا گرم و هوڕ دەکەن؟

سەربازی دوەم: جولەکەن.. ئەمانە هەروان، لەسەر دینەکەیان هەر هەرایانە.

سەربازی یەکەم: بۆچی لەسەر دینەکەیان هەرایانە؟

سەربازی دوەم: نازانم.. ئەوانە هەمیشە لە هەرایەکی بێبڕانەوەدان.. فەرەییوکان دەڵێن پەری هەیەو سەدوقیەکان دەڵێن پەری نیە.

سەربازی یەکەم: وابزانم هەرا لەسەر شتی وا شتێکی قۆڕە!

لاوە سوریەکە: ئەمشەو شاکچ سالۆمی چەند جوانە!

نۆکەری سالۆمی: تۆ هەر سەیری ئەکەی.. زۆر بە وردی تێی دەڕوانی.. باش نیە وا سەیری خەڵك بکەی، شتێکت بەسەردێت!

لاوە سوریەکە: ئەمشەو زۆر جوان دیارە!

سەربازی یەکەم: تێڕوانینی کوێخا دڵتەنگ دەکات!

سەربازی دوەم: بەڵێ وایە!

سەربازی یەکەم: سەیری من دەکات.

سەربازی دوەم: سەیری یەکێك دەکات.



بەرگی دەستنوسی شانۆنامەکە

سەربازی یەکەم: ئاخۆ سەیری کێ بکات؟

سەربازی دوەم: نازانم.

لاوە سوریەکە: ئەمشەو سالۆمی ڕەنگی هەڵبزڕکاوە.. هێشتا وام نەدیوە.. ئەڵێی سێبەری گوڵێکی سپیە لە ئاوێنەیەکی زیویندا.

نۆکەری هیرۆدیا: وای سەیر مەکە.. تۆ زۆری سەیر دەکەی.

سەربازی یەکەم: وا هیرۆدیا پەرداخەکەی کوێخای پڕکرد.

کابا دۆکی: شاژنە هیرۆدیا ئەوەیە کە ئەو لاوە ڕەشە پڕ مرواریەی لەسەرایە و قژی بەو تۆزە شتە بۆن خۆشە ڕازاندۆتەوە؟

سەربازی یەکەم: بەڵێ، ئەوەی هیرۆدیای ژنی کوێخا.

سەربازی دوەم: کوێخا زۆر حەز لە مەی دەکات، سێ چەشن مەی هەیە، یەکێکی بنەوشەیی ڕەنگی وەك کەماکەی قەیسەری لە دۆرگەی سامۆتراسەوە بۆ هاتوە.

ئابادۆکی: من قەیسەرم نەدیوە!

سەربازی دوەم: چەشنی دوەمیش وەك ئاڵتوونی تێزاب زەردە لە قوبرسەوە هاتوە.

ئابادۆکی: من حەز لە ئاڵتون دەکەم!

سەربازی دوەم: چەشنی سێهەمیش کە وەك خوێن سوورە لە سقیلەوە بۆی هاتوە.

لاوه تۆبییەکە: خوای وڵاتەکەم حەز لە خوێن دەکات، بۆیە ساڵی دوو جار پەنجا لاو، و سەد کیژۆڵەی بۆ دەکەین بە قوربانی، بەڵام وا دیارە بەمەش تینویەتی ناشکێ، چونکە هێشتا هەر دڵڕەقە لەگەڵمانا.

ئابادۆکی: لە وڵاتی ئێمەدا شوێنەواری خوا نەماوە.. ڕۆمانیەکان دەریان پەڕاندن، هەندێك هەر دەڵێن ئەم خوایانە لە ناو شاخەکاندا خۆیان شاردۆتەوە، بەڵام بڕوا بەمە ناکەم. چونکە سێ ڕۆژ بە دویاندا گەڕام نەمدین، لە دوایشدا کە بانگم کردن وەرامیان نەدامەوە.. دیارە هەموویان مردوون!

سەربازی یەکەم: جولەکەکان خوایەك دەپەرستن کە نابینرێ.

ئابادۆکی: لەمە ناگەم.

سەربازی یەکەم: لە ڕاستیا بڕوا بە زۆر شت دەکەن کە نابینرێن.

ئابادۆکی: ئەمانە لای من هەمووی شتی قۆڕ و پڕوچووچە!

دەنگی یۆحەنا: لە دوای منەوە یەکێکی بەهێزی وا دێت کە من شایانی ئەوە نیم هەتا پێڵاوەکانیشی بۆ داکەنم. کە دێیش هەموو شوێنێکی سەخت و بەردەڵان پەرەئەسێنێ و گوڵی لێ دەڕوێ، کوێر دەبینێ و کەڕ دەبیسێ، دەشت بەسەر لانەی دڕندان دەگرێ و شێر بە یاڵەکەی ڕائەکێشێ!

سەربازی دوەم: بێدەنگی کەن.. هەمیشە هەر وڕێنە دەکات.

سەربازی یەکەم: نەء، نەء.. پیاوی چاکە.. هەرچەند شتێکی دەدەمێ بیخوات سوپاسم دەکات!

ئابادۆکی: ئەم کابرایە کێیە؟

سەربازی یەکەم: یۆحەنا!

ئابادۆکی: لە کوێوە هاتوە؟

سەربازی یەکەم: لە بیابانەوە.. لەوێ بە کوللەو هەنگوین خواردن دەژیا و کوڵکەی حوشتری لەبەر دەکرد و پشتێکی پێستی بە کەلەکەیەوە دەبەست. دیمەنی زۆر ترسناك بوو!.. خەڵکێکی زۆریشی بەدواوە بوو.. قوتابیەکی بێ شوماریشی هەبوو.

ئابادۆکی: دەربارەی چی قسە دەکات؟

سەربازی یەکەم: نازانین.. زۆر جار قسەی سەیری وا دەکات کە تێی ناگەین.

ئابادۆکی: دەتوانرێ ببینرێ؟

سەربازی یەکەم: نەء، کوێخا ئەمەی قەدەغە کردوە.

لاوه سووریەکە: وا شاکچ ڕووی بە باوەشێنەکەی داپۆشی! وا دوو دەستە بچوکەکانی کە وەك کۆتر وان ڕاوەشاند.. دەستەکانی زۆر لە پەپوولەی سپی دەچن!..

نۆکەری هیرۆدیا: بەتۆ چی؟.. بۆ سەیری دەکەی؟ نابی وا سەیری بکەی.. شتێکت بەسەردێت!

ئابادۆکی: (پەنجە بۆ حەوزەکە ڕادەکێشێ) ئەمە بەندیخانەیەکی چەند سەیرە!

سەربازی دوەم: زیندانێکی کۆنە!

ئابادۆکی: زیندانێکی کۆنە! ڕەنگە پیسیش بێ.

سەربازی دوەم: نەء! نەء! برای کوێخای گەورە، مێردی شاژن هیرۆدیای یەکەم، دوازدە ساڵ تیایدا بەندکرانەش مرد، لە دواییشدا سەربڕرا.

ئابادۆکی: سەربڕرا؟

ئابادۆکی: سەربڕرا؟ کێ وێرای ئەمە بکات؟

سەربازی دوەم: پەنجە بۆ سەربڕە زلەکە ڕائەکێشێ " نەعمان وێرای!

ئابادۆکی: نەترسا؟

سەربازی دوەم: نەء! کوێخا ئەموستیلەکەی بۆ نارد.

ئابادۆکی: کام ئەموستیلە؟

سەربازی دوەم: ئەموستیلەی مردن، لەبەرئەوە نەترسا!

ئابادۆکی: لەگەڵ ئەوەشدا سەربڕینی پادشایەك کارێکی ناپەسەندە!

سەربازی دوەم: بۆ؟ پادشاش وەك خەڵکی تر یەك ملیان هەیە!

ئابادۆکی: هەرچۆنێك بێ، کارێکی ناپەسەندە.

لاوه سووریەکە: وا شاکچ لەسەر خوانەکە هەڵدەستێ! پەشۆکاویش دیارە؛ ئاه! وا بەرەو ڕوومان دێت.. بەڵێ، بەرەو ڕوومان دێت.. چەند هەڵبزرکاوە!.. هێشتا وا بە هەڵبزرکاوی نەمدیوە!

نۆکەری هیرۆدیا: ڕووت وەرگێڕی! سوێندنت دەدەم ئەوەندە تێی مەڕوانە!

لاوه سوریەکە: وەك کۆتری سەر لێشێواو وایە.. وەك نێرگس وایە کە شەماڵ دەیشەکێنێتەوە.. وەك گوڵێکی زیوین وایە!..

"سالۆمی دێت"

سالۆمی: لێرە نامێنمەوە.. ناتوانم بمێنمەوە.. بۆچی کوێخا بە چاوەکانیەوە کە وەك چاوی جرجە کوێرە وایە وا سەیرم دەکات؟ نەمدیوە باوە پیارە وا سەیری هەنەزا بکات.. نازانم مەبەستی چیە.. لە ڕاستیا نازانم واتای چیە..

لاوه سوریەکە: شازادە! هەر ئێستا لە ئاهەنگەکەوە دێیت؟

سالۆمی: لێرە شەماڵ چەند دڵگیرە! لێرە دەتوانم پڕ بە سیەکانم هەناسە وەرگرم.. لەناوەوە جولەکەکانی ئۆرشەلیم بە هەراو بگرو ئاهەنگە پوچەکانیان مێشك کون دەکەن.. بەربەریەکانیش ورگیان پڕدەکەن لە مەی و لەپاشدا لەسەر زەویە پاکەکە تف ئەکەنەوە. یۆنانیە چاوڕێژراوە قژ لوولەکان..

میسریە ڕازاوە لەسەرخۆ نینۆك سەوزە درێژەکان و چارشێوە ڕەشەکانیان.. ڕۆمانیە زلە قەبەکان کە زبانێکی نەدیار قسە

دەکەن.. ئاه! چەند ڕقم لە ڕۆمانیەکانە.. چونکە بە دەیانەوێ خۆیان بە خانەدان دەربخەن.

لاوە سوریەکە: شازادە! دادەنیشیت؟

نۆکەری هیرۆدیا: بۆ قسەی لەگەڵ دەکەی؟

بۆ سەیری دەکەی؟ ئاه!.. شتێکت بەسەر دێت!

سالۆمی: مانگ چەند جوانە! دەڵێی بەچکە پشیلەی ساوایە.. یان وا دەزانی گوڵێکی زیوینی بچووکە.. مانگ ساردو پاکە.. گومان نیە کە کیژۆڵەیەکی دەست لێنەدراوە.. چونکە جوانیەکەی لە جوانی کیژۆڵە دەچێت.. بەڵێ.. کیژۆڵەیەکە خۆی پیس نەکردوەو وەك خواکانی تر خۆی نەداوە بە دەست پیاوانەوە!

دەنگی یۆحەنا: خوا هات.. کوڕی مرۆڤ هات و کچانی زەریا لە رووبارەکاندا خۆیان شاردەوە و پەریەکانی لەژێر دارستانە سەوزەکاندا پاڵ کەوتن.

سالۆمی: کێ بوو ئەم قسەیە دەکات؟

سەربازی دوەم: شازادە، ئەوە پێغەمبەرە!

سالۆکی: کەواتە ئەو پێغەمبەرەیە کە کوێخا لێی دەترسێ؟

سەربازی دوەم: نازانین، شازادە.. بەڵام ئەم خاوەن دەنگە پێغەمبەر یۆحەنایە.

لاوە سوریەکە: شازادەکەم، دەتەوێ کەژاوەکەت بۆ بهێنینە ئێرە؟ شەوی بەرمانگە شەوی باخچەکە خۆشە.

سالۆمی: زۆر شتی ناپەسەند دەربارەی دایکم دەڵێ، وانیە؟

سەربازی دوەم: شازادەکەم، لە ڕاستیا ناتوانین لە قسەکانی بگەین.

سالۆمی: بەڵێ، شتی ناپەسەندی دەربارە دەڵێ.

"یەکێك لە کۆیلەکان دێت"

کۆیلە: شازادەکەم، کوێخا تکات لێدەکات بچیتەوە ژووری بۆ بەشداربوونت لە ئاهەنگەکەدا.

سالۆمی: ناچم!

لاوە سوریەکە: شازادەکەم، ببوورە.. ڕەنگە ئەگەر سەرپێچی بکەی باش نەبێ.

سالۆمی: ئەم پێغەمبەرە پیرە؟

لاوە سوریەکە: شازادەکەم، باشتر ئەوەیە بچیتەوە لای.. با بێم ڕەوانەت کەم.

سالۆمی: پیرە؟

سەربازی یەکەم: نەخێر شازادەکەم، لاوێکی تازە پێگەیشتوە.

سەربازی دوەم: ناتوانی لەمە دڵنیابی، چونکە دەڵێن کە ئەو "ئیلیا"یە.

سالۆمی: ئیلیا کێیە؟

سەربازی دوەم: شازادەکەم، پێغەمبەرێکی کۆنی ئەم شارەیە.

کۆیلە: وەرامی شازادە بۆ کوێخا چیە؟

دەنگی یۆحەنا: ئەی سەهیۆنتا دڵخۆش مەبە، ئەو دارەی پێی لێت درا دەشکێت.. چونکە لە مار مار دەبێت و ئەوەی لێی دەبێت چۆلەکە قوت دەدات.

سالۆمی: ئەم دەنگە چەند سەیرە! خۆزگە قسەم لەگەڵ بکردایە!

سەربازی یەکەم: شازادەکەم، ئەمە ناشێ کوێخا دواندن و لێ نزیك کەوتنەوەی قەدەغە کردوە.. هەتا زێوانە گەورەکەش قەدەغە کراوە بیدوێنێ.

سالۆمی: دەمەوێ بیدوێنم.

سەربازی یەکەم: شازادەکەم ئەمە ناشێ.

سالۆمی: قسەی لەگەڵ دەکەم.

لاوە سوریەکە: باشتر ئەوە نیە بگەڕێیتەوە لای ئاهەنگەکە؟

سالۆمی: ئەم پێغەمبەرەم بۆ بێنن!

"کۆیلەکە دەچێتە دەرێ"

سەربازی یەکەم: شازادەکەم، ناوێرین!

سالۆمی: (لە زیندانەکە نزیك دەبێتەوە و سەیری بنەکەی دەکات) ئەم زیندانە چەند تاریکە! دەڵێی گۆڕە! ئەم شوێنە چەند ترسناکە (بۆ سەربازەکان) گوێتان لێم نەبوو؟ بۆم بێنن.. لەم زیندانە دەری بێنن.. دەمەوێ بیبینم.



سەربازی یەکەم: شازادەکەم، سوێندت دەدەم داوای ئەمەمان لێ مەکە!

سالۆمی: هەروا چاوەڕێم پێ دەکەن؟

سەربازی یەکەم: شازادەکەم، گیانمان لە خەڵاتتە، بەڵام ناتوانین ئەمەت بۆ بکەین.. لە ڕاستیا ناشێ تۆ ئەم داوایە بکەی!

سالۆمی: (سەیری لاوە سوریەکە دەکات) ئاه!

نۆکەری هیرۆدیا: خوایە! چی ڕوودەدات؟ من دڵنیام کە کارەساتێك دەقەومێ.

سالۆمی: (لە لاوە سوریەکە نزیك دەبێتەوە).

نارابۆت، ئەمەم بۆ ئەکەی.. وانیە؟ لە بەر من دەیکەی.. من هەمیشە لەگەڵتدا باش بووم و تۆش ئەوەم بۆ دەکەی کە پێتی دەڵێم. دوا ئاواتم بینینی ئەم پێغەمبەرە سەیرەیە کە بوە بە تاو قسەی دەربارە دەکرێ. چەند جار گوێم لێ بوە کوێخاش دەبارەی دەدوا.. واش بزانم کوێخا لێی دەترسێ. نارابۆت، تۆش لێی دەترسیت؟

لاوە سوریەکە: شازادەکەم لێی ناترسم، کەسیش نیە لێی بترسم، تەنها ئەوە نەبی کە کوێخا فەرمانی داوە کەس سەرقاپی ئەم زیندانە هەڵنەداتەوە.

سالۆمی: ناربۆت، ئەمەم بۆ دەکەی.. کە سبەینێش بە کەژاوەکەمەوە بەژێر دەرگا گەورەکەدا ڕابوردم کە بت فرۆشەکانی لێدادەنیشن گوڵێکی سەوزت پیا دەدەم، گوڵێکی سەوزی بچکۆلە.

لاوە سوریەکە: ناتوانم شازادەکەم، ناتوانم!

سالۆمی: (بە زەردەخەنەوە) نارابۆت، لەبەر من دەیکەی.. خۆشت باش دەزانی کە لەبەر من دەیکەی.. کە سبەینێش لەسەر پردی بت کرەکانەوە ڕۆیشتم لەژێر پەچە لۆکە تەنکەکەمەوە سەیرت دەکەم؟ بە لایەکی چاو.. ڕەنگە بۆشت پێبکەنم. نارابۆت سەیرم کە، نارابۆت سەیرم کە. ئاه! دەزانی ئەوەی داوات لێ دەکەم دەیکەی.. ئەمە باش دەزانیت. دەزانم لە بەجێهێنانی ئەم کارە دواناکەوی.

لاوە سوریەکە: (بۆ سەربازی سێهەم) با پێغەمبەرەکە بێتە لامان.. شازادە سالۆمی دەیەوێ ببینێ.

سالۆمی: ئاه!

نۆکەریی هیرۆدیا: دیمەنی مانگ چەند سەیرە! دەڵێی دەستی ژنێکی مردوە بۆ کفن دەگەڕێ لە خۆیەوە بپێچێت.

لاوە سوریەکە: لە ڕاستیا دیمەنەکەی سەیرە! وەك شازادە وایە کە لەودیو پەچە تەنکەکەیەوە پێدەکەنێ.

(پێغەمبەرەکە لە زیندانەکە دەردەهێنرێ، سالۆمی تێی دەڕوانێ و ئەسڵەمێتەوە بۆ دوا).

یۆحەنا: کوا ئەوەی پەرداخی خراپەی سەلێو بوە؟ کوا ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان لەبەرچاوی هەموو مرۆڤێك بە بەرگە زیوینەکەیەوە دەمرێت؟ با بێتە پێشەوە گوێ لەوە بگرە کە لە بیابان و چۆڵی و کۆشکی پاشایاندا نەڕاندوویەتی.

سالۆمی: دەربارەی کێ دەدوێ؟

لاوە سوریەکە: شازادەکەم، کێ دەزانێ!

یۆحەنا: کوا ئەو ئافرەتەی وێنەی پیاوەکانی دی لەسەر دیوارەکان، وێنە ڕەنگاوڕنگی کلدانیەکان و خۆی دا بە دەست ئارەزوەکانیەوەو ڕابەرەکانی نارد بۆ ئووری کلدانیەکان؟

سالۆمی: دەربارەی دایکم قسەدەکات!

لاوە سوریەکە: نەء، نەء شازدەکەم.

سالۆمی: با، دەربارەی دایکم قسەدەکات.

یۆحەنا: کوا ئەو ژنەی لەشی فرۆشت بە فەرماندەری ئاشوریەکان، ئەوانەی شیریان بە قەدەوەیەو سەربازی بە چەپکی ڕەنگاوڕەنگ دائەپۆشن؟ کوا ئەو ئافرەتەی خۆی دا بە دەست لاوە میسریە چالاکەکانەوە، ئەوانەی زریەکانیان لە زێڕ و کڵاوە زریەکانیان لە زیوە؟ با لەسەر جێگا پیسەکەی هەستێت و گوێ لەوە بگرێ کە ڕێ بۆ خوای تەنها پاك دەکاتەوە، با لە خراپەکانی وردبێتەوە و تۆبە بکات. هەرگیز تۆبە ناکات و ئەوەندەی موویەك لە خراپەکانی لانادات، بەڵام با هەشتێت و بێتە لای ئەو پیاوەی کە باوەشێنی خوای لەدەستدایە!

سالۆمی: ترسناکە! ترسناکە!

لاوە سوریەکە: تکایە شازادەکەم، لێرە مەمێنەرەوە.

سالۆمی: جوانترین ئەندامی چاویەتی.

وەك دوو کونی ڕەش وان کە تیشکێك لە نیوەندی مافووری دەستکردی (صوور) تیشکیان پێی پەیدا بکات. وەك ئەشکەوتی ڕەش وان کە شێر دەیکات بە لانە. وەك ئەشکەوتە تاریکەکانی میسر وان کە شێر کردوونی بە لانە.. وەك گۆمە ڕەشەکان وان کە تیشکە سەیرەکەی مانگ لێیان دەکات.. تۆ بڵێی لەسەر قسەکردنەکەی بڕوات؟

لاوە سوریەکە: شازادەکەم، بڕۆ، لێرە مەمێنەرەوە.

سالۆمی: قەدی چەند باریکە! دەڵێی پەیکەرێکی وردی لە عاج دروست کراوە.. وەك وێنەیەکی زیوین وایە.. لێشم ڕوونە کە وەك مانگ پاکە.. وەك تیشکی مانگ و چیلکەی زیو وایە.. گۆشتەکەشی وەك عاج ساردە. کەمێك لێی نزیك ئەبمەوە با باش ببینم.

لاوە سوریەکە: نەء، نەء، ئەمە مەکە شازادەکەم.

سالۆمی: دەبێ لە نزیکەوە ببینم.

لاوە سوریەکە: شازادەکەم! شازادەکەم!

یۆحەنا: ئەم ئافەرتە کێیە سەیرم دەکات؟

نامەوێ سەیرم بکات. بۆچی بەو دوو چاوە زێڕینە نەرمانەیەوە سەیرم دەکات؟ من نایناسم و ناشمەوێ بیناسم، با لێم دوورکەوێتەوە چونکە نایدوێنم.

سالۆمی: من سالۆمیم، کچی هیرۆدیاو شازادەی جوولەکە.

یۆحەنا: کچی بابل دووركەوەرەوە.. لە هەڵبژاردەی خوا نزیك مەبەرەوە.. دایکت زەوی بە خراپە پڕ کردوە و هامدای خراپەکانی گەیشتۆتە دەم خوا.

سالۆمی: قسە بکەرەوە یۆحەنا، دەنگت مەیە بۆ من!

لاوە سوریەکە: شازادەکە! شازادەکە! شازادەکە!

سالۆمی: دەی یۆحەنا قسە بکە، قسە بکەو پێم بڵێ چی بکەم!

یۆحەنا: کچی سرۆم نزیکم مەکەوەرەوە، بەڵکو ڕووت داپۆشەو خۆڵ بکە بەسەرتا و بڕۆرە بیابان و لە کوڕی مرۆڤ بگەڕێ. بەڵکو بیدۆزیتەوە.

سالۆمی: ئەم کوڕی مرۆڤە کێیە؟ یۆحەنا، وەك تۆ جوانە؟

یۆحەنا: لە پشتەوە بوەستە.. گوێت لە شەقەی باڵی پەری مردنە لە کۆشکەکەدا!

لاوە سورریەکە: شازادەکەم! تکایە بگەڕێرەوە کۆشکەکە.

یۆحەنا: ئەی پەری مردن! چی دەکەی لێرە بە شیرەکەتەوە



کێت لە دانیشتوانی ئەم کۆشکە پیسە دەوێ؟ هێشتا نۆرەی ئەوەی لە بەرگە زیویەکانیدا دەمرێت نەهاتوە.

سالۆمی: یۆحەنا!

یۆحەنا: کێیە قسە دەکات؟

سالۆمی: یۆحەنا.. حەز لە لەشت دەکەم!..

لەشت وەك گوڵ پەمووی نەدراوە سپییە. لەشت وەك بەفری سەر لوتکەکان سپییە.. وەك بەفری سەر شاخی کورەی جولەکە وایە.. گوڵەکانی باخی شاژنی نیمچە دۆرگەی عارەب وەك پێستی تۆ سپی نیە.. گوڵی باخی شاژنی نیمچە دورگەی عارەب لە سپیەتیدا چۆن دەگاتە سپیەتی پێستەکەت، باخی بەهارانی بۆن خۆش؟ هیچ سپییەتیەك ناگاتە پێستەکەت، نە سپیەتی شەبەق کە بە قاچە بچوکەکانی گەلاکانی دەشێلا، نە سپیەتی مانگ کە دەیدا لە ڕووی زەریا فراوانەکان، ئەمانە هیچیان ناگەنە سپیەتی تۆ. لە جیهاندا لە تۆ سپیتر نیە. با دەست لە لەشت بدەم!

یۆحەنا: ئەی کچی بابل دووركەوەرەوە! خراپە لەگەڵ ژندا هاتە سەرزەوی، مەمدوێنە، گوێت لێناگرم، چونکە هەر گوێ لە دەنگی خوای تەنها دەگرم.

سالۆمی: لەشت ترسناکە، وەك لەشی گول وایە.. وەك قوڕی گوێ هێلانەی مارو دوپشك وایە.. وەك گۆڕی سپی پڕە لە پیسی، ترسناکە! لەشت ترسناکە! یۆحەنا، من بۆ قژت سوتاوم.. قژت وەك هێشوە ترێ ڕەشکەی ئەدۆمی ولاتی ئەدۆمیەکان وایە.

قژت وەك دارە گەورەکانی لبنان وایە کە شێرو دز لە ڕۆژی نیوەڕۆدا خۆیان لەژێردا دەشارنەوە. لەکوێ ڕەشی شەوان کە ڕۆژیان لێ ئاوا دەبێ ئەستێرە هەڵدێت دەگاتە ڕەشی قژت؟

بێدەنگی ناو دارستانەکان ناگاتە ڕەشیەکەی. لە جیهاندا لە قژت ڕەشتر نیە.. با دەست لە قژت بدەم!

یۆحەنا: بگەڕێرەوە کچی سرۆم! دەستم لێمەدە.. پەیکەری خوا پیس مەکە.

سالۆمی: قژت ترسناك و قوڕ و خۆڵاویە. وەك چەپکە دڕك هاتۆتە سەر ناوچەوانت.. وەك چەند مارێکی ڕەشیش ویە لە ملت ئالاوە.. من حەز لە قژت ناکەم.. یۆحەنا حەز لە دەمت دەکەم.. وەك کەمەندێکی ئاڵ وایە لە لوتکەی باروویەکی[1] عاجی. دەڵێی هەنارێکەو و بە چەقۆی عاج لەت کراوە! لە کوێ سووری گوڵە هەناری سوورترە دەگاتە سوری دەمت؟ لە کوێ سوری دەنگی زوڕنا سورەکانی دەکاتێ کە نزیك بوونەوەی شا بڵاو دەکاتەوە و ترس دەخاتە دڵی دوژمنەوە؟..

دەمت لە قاچی ئەوانە سورترە کە ترێ ئەشێلن بۆ مەی دروست کردن.. لە قاچی ئەو کۆترانە سوورترە کە لەسەر پەیکەرەکان هێلانە ئەکەن و زیوانەکان دانیان دەدەن. لە قاچی ئەوەش سورترە کە لە دارستاندا شێرێکی سەربڕیوە. دەمت وەك چڵە مەرجانێك وایە کە ڕاوکەرەکان لە ناخی زەریا تاریکەکاندا دۆزیویانەتەوە، ئەو مەرجانەی دەیدەن بە پادشایان!.. وەك گۆگردی جیوە وایە کە مۆئابیەکان لە کانەکانی مۆئاب دەریدەهێنن و پادشکان داگیری دەکەن. وەك کەوانەکەی شای فارس وایە کە بە ڕۆنی بنەوشەیی چەورکراوە و لە مەرجانە هەڵکێشراوە. لە جیهاندا لە دەمت سورتر نیە.. با دەمت ماچ بکەم!

یۆحەنا: نەء کچی سرۆم، نەء کچی سرۆم.

سالۆمی: دەمت ماچ دەکەم یۆحەنا، دەمت ماچ دەکەم!

لاوە سوریەکە: شازادەکەم سەیری ئەم کابرایە مەکە.. تۆ کەوەك باخێکی تاڵی کۆتری کۆترانی وا سەیری مەکەو ئەم قسانەی لەگەڵا مەکە.. ناتوانم گوێیان لێبگرم.. شازادەکەم، ئەم قسانە مەکە!

سالۆمی: یۆحەنا، دەمت ماچ دەکەم.

لاوە سورەکە: ئاه (خۆی دەکوژێ و لە نێوەندی سالۆمی و یۆحەنادا دەکەوێ)

نۆکەری هیرۆدیا: لاوە سوریە کە خۆی کوشت! فەرماندە لاوە کە خۆی کوشت!.. هاوڕێکەم خۆی کە خۆی کوشت!.. هاوڕێکەم خۆی لەناو برد! گۆزەیەك مەی و ملوانکەیەکی گرانبەهام دابوویە بەڵام وا خۆی کوشت! ئاه! نەیوت کارەساتێك دەقەومێ؟ منیش ئەمەم وت. ئەمزانی کە مانگ لە ڕوویەك دەگەڕێ، بەڵام بە مێشکما نەدەهات بۆ ئەو بگەڕێ. ئاه! بۆچی لە مانگ نەمشاردەوە؟ ئەگەر لە ئەشکەوتێکدا بمشاردایەوە مانگ نەیدەبینی.

سەربازی یەکەم: شازادەکەم: شازادەکەم، فەرماندەرە لاوەکە خۆی کوشت.

سالۆمی: یۆحەنا! با دەمت ماچ کەم.

یۆحەنا: کچی هیرۆدیا، ناترسی؟ پێم نەوتی گوێم لە شەقەی باڵی پەری مردنە؟ پەری مردن نەهات؟

سالۆمی: با دەمت ماچ کەم.

یۆحەنا: ئەی زۆڵ، هیچ نیە ڕزگارت کات ئەوە نەبێ کە قسەی دەربارە دەکەم. بڕۆو بەدوایدا بگەڕێ. لە بەلەمێکدایە لە زەریای مەزندا لەگەڵ قوتابیەکانیدا دەدوێ. لە سەر ڕۆخی زەریاکە ئەژنۆ دادەو بانگی بکە. کە هاتیش– دێت بۆ لای هەموو ئەوانەی بانگی دەکەن خۆت بدە بەسەر قاچیداو داوای لێبوردنی لێبکە.

سالۆمی: با دەمت ماچ بکەم.

یۆحەنا: بە لەعنەت بی کچی حیز، بە لەعنەت بی!

سالۆمی: یۆحەنا، دەمت هەر ماچ دەکەم.

یۆحەنا: نامەوێ سەیرت بکەم. سەیرت ناکەم.. تۆ مەلعونی سالۆمی، تۆ مەلعونی!

(دەچێتەوە ناو زیندانەکە)

سەربازی یەکەم: دەبێ لاشەکە لابەین.. کوێخا حەز لە بینینی لاشە ناکات، بێجگە لەو لاشانەی خۆی دەیانکوژێ.

نۆکەری هیرۆدیا: برام بوو.. بگرە لە برام نزیکتر بوو. پێکەوە شەوان لە گوێ ڕوبار و لە بەینی سێبەری دار بادەمەکاندا دەگەڕاین و دەربارەی وڵاتەکەی قسەی بۆ دەکردم. زۆر بە نزمی قسەی دەکرد، دەنگی وەك لەرەی شمشاڵ وابوو. زۆریش حەزی دەکرد سەیری وێنەی خۆی بکات لە ئاوە بریقەدارەکەدا.. چەندیش پێم وت ئەمە نەکات.

سەربازی دوەم: ڕاست دەکەی.. دەبێ لاشەکە بشارینەوە بۆ ئەوەی کوێخا نەیبینێ.

سەربازی یەکەم: کوێخا نایەتە ئێرە.. هەرگیز نەهاتۆتە هەیوان، زۆر لە پێغەمبەرەکە دەترسێ.

(هیرۆدس و میرۆدیا و دەستوپێوەندەکان دێنە لایان)

هیرۆدۆس: کوا سالۆمی؟ کوا شازادە؟ بۆچی وەك فەرمانم پێدا نەهات؟ ئا ئەوەتانێ!

هیرۆدیا: بەدوویدا مەگەڕێ، تۆ هەر بە دوویدا دەگەڕێی.

هیرۆدۆی: ئەمشەو دیمەنی مانگ زۆر سەیرە، وانیە؟ وەك ژنێکی شێت وایە.. ژنێکی شێت کە هەمیشە لە دۆست دەگەڕێ. ڕووتیشە و هەور دەیەوێ ڕووتیەکەی بشارێتەوە، بەڵام نایەڵێت، بە ڕووتی لە گۆی ئاسماندا دەردەخات و بەناو هەورەکاندا وەك ژنێکی سەرخۆش تێدەپەڕێ. من دڵنیام کە بەدووی یارەکانیدا دەگەڕێ.. نابینین وەك ژنی پڕ ئارەزوو لەنجە دەکات؟ وەك ژنێك شێت وایە، وانیە؟

هیرۆدیا: نەخێر، مانگ وەك مانگەو بڕایەوە! با بچینەوە ژوورێ، پێویست ناکات لێرە بمێنینەوە.

هیرۆدۆس: لێرە دەمێنمەوە! مەنیس، مافوور لێرە داخەو چرا داگیرسێنە! خوانە عاجی و بەشیەکان (بەشی لاژوەردیکی بەنرخە) بێنە. هەوای ئێرە خۆشە.. لێرە مەی لەگەڵ میوانەکاندا دەخۆمەوە.. دەبێ ئاهەنگەکەمان زۆر بێ لەبەر رابەرەکانی قەیسەر.

هیرۆدیا: بۆ لەبەر ئەوان لێرە دەمێنیتەوە؟

هیرۆدۆس: بەڵێ، هەوا لێرە خۆشە. وەرە هیرۆدیا، میوانەکانمان چاوەڕێمان دەکەن. ئاه! قاچم خلیسکا، لەسەر خوێن خلیسکام.. نوقڵانەیەکی خراپە.. زۆر خراپ.. ئەم خوێنە هی کوێیە؟ ئەم لاشەیە هی کێیە لێرە فڕی دراوە؟ بۆچی من پاشاکانی میسرم کە میوانی دێت لاشەیان پیشات دەدات؟ ئەمە لاشەی کێیە؟ سەیری ناکەم.

سەربازی یەکەم: گەورەم فەرماندەرەکەمانە، لاوە سوریەکەیە کە پێش سێ ڕۆژ کردت بە فەرماندەر.

هیرۆدۆی: بەڵام فەرمانی کوشتنیم نەداوە!

سەربازی دوەم: گەورەم، خۆی کوشت.

هیرۆدۆی: بۆ؟ خۆ پایەم بەرزکردەوە!..

سەربازی دوەم: گەورەم نازانین، بەڵام خۆی کوشت.

هیرۆدۆی: شتێکی سەیرە! من وام دەزانی تەنها فەیلەسوفەکانی ڕۆمان خۆیان دەکوژن، وانیە تیجیلۆنیۆی؟ فەیلەسوفەکانی ڕۆمان خۆیان ناکوژن؟

تیجیلۆنیۆی: گەورەم هەندێکیان خۆیان دەکوژن کە پێیان دەڵێن ڕواکی، ئەمانە ئەستور و چارەگران و پێکەنین هێنەرن، من، خۆم، بە چاوێکی سوك سەیریان دەکەم.

هیرۆدۆس: منیش هەروەها، شتێکی جوان نیە مرۆڤ خۆی بکوژێ.

تیجیلۆنیۆی: هەموو خەڵکی ڕۆما گاڵتەیان پێدەکەن. ئیمپراتۆریش هەڵبەستێکی ڕێکخستوە تیایدا گاڵتەیان پێدەکات و هەموو زبانێك لە هەموو شوێنێك دەیڵێتەوە.

هیرۆدۆس: بەڕاستتە؟ لە ڕاستیا قەیسەر سەیرە! دەتوانێ هەموو شتێك بکات سەیریشە لاوە سوریەکە خۆی بکوژێ، زۆر



خەمی بۆ دەخۆم، ئەوەندە جوانکیلە بوو خەڵك دەیەویست سەیری بکات. زۆریش سەیری سالۆمی دەکرد.

هیرۆدیا: باوکی لاوە سوریەکە پاشای وڵاتەکەی بوو دەرمکرد. دایکیشی شاژن بوو تۆ کردت بە کەنیزەك. خۆشی لێرە میوان بوو کردم بە سەرۆکی پاسەوانەکان. لە ڕاستیا ونم کرد.. بەڵام بۆچی لاشەکەیان لانەبردوە؟ سەیری ناکەم، هەر ئێستا لایبەن (لاشەکە لادەبرێ). شەوێکی ساردە، باش بە قایم هەڵیکردوە.. هەست بە جوڵەی بایەکە ناکەن؟

هیرۆدیا: نەء، کوا با هەیە!

هیرۆدس: دەڵێم بایەکی بەهێزی دێت.. گوێشم لە شەقەی باڵێکی گەورەیە لە دەورم.. گوێت لێنیە؟

هیرۆدیا: نەء، گوێم لە هیچ نیە!

هیرۆدس: منیش، ئێستا گوێم لێنیە، بەڵام لە پێشدا گوێم لێبوو. ئەوەی کە گوێم لێبوو گومانم نیە دەنگی با بوو. وا هەمیسان گوێم لێیە. تۆ گوێت لێ نیە؟ شەقەی باڵە!

هیرۆدیا: دڵنیام کە بە هەڵەداچووی، نەخۆشیت، با بچینەوە ژوورێ.

هیرۆدۆس: نەخۆش نیم، بەڵکو کچەکەت نەخۆشە.. هێشتا وا بە هەڵبزرکاوی نەمدیوە.

هیرۆدیا: پێم وتی سەیری مەکە!

هیرۆدۆس: مەیم بۆ تێکە (مەی دەهێنن) سالۆمی وەرە مەیم لەگەڵا بخۆرەوە. مەیەکەم ئەنتیکەیە، قەیسەر خۆی پێشکەشی کردووم. لێوە ئاڵەکانی پێ تەڕبکە با منیش لە پاش تۆ چۆڕپڕی بکەم.

سالۆمی: تینووم نیە.

هیرۆدۆس: قسەی کچەکەت گوێ لێیە؟

هیرۆدیا: چاکی کرد. بۆچی چاوی لێ ناتورکێنی؟

هیرۆدس: بەری گەیوم بۆ بێنن (بەری بۆ دەهێنن) وەرە سالۆمی لە گەڵما بخۆ، حەزدەکەم شوێنەواری دانە وردەکانت لەم بەرانەدا ببینم. قەپاڵێك لەم بەرە گەیوە بگرە منیش پاشماوەکەی دەخۆم.

سالۆمی: برسیم نیە.

هیرۆدۆس: (بۆ هیرۆدیا) دیارە ئەنجامی پەروەردەکردنی کچەکەت ئەبەم جۆرە دەبینی.

هیرۆدیا: من و کچەکەم وەچەی پادشاین، بەڵام تۆ باوکت.

هیرۆدۆس: درۆ دەکەی!

هیرۆدیا: خۆشت دەزانی کە ڕاست دەکەم.

هیرۆدۆس: سالۆمی، وەرە لامەوە دانیشە تەختەکەی دایکت دەدەمێ.

سالۆمی: ماندوو نیم.

هیرۆدیا: دەبینی چۆن بە قسەت دەکات؟

هیرۆدۆس: بۆم بێنن.. داوای چیم کرد؟

بیرم چوە.. ئا، ئا.. بیرم کەوتەوە.

دەنگی یوحەنا: کات بەسەرچوە! خوای تەنها دەڵی ئەوەی نوقلانەم بۆ لێدابوو ڕوی دا. ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە باسم دەکرد.

هیرۆدیا: فەرمان بدە بێدەنگ بێ، نامەوێ گوێم لە دەنگی بێ.. ئەم کابرایە هەر جنێوم پێدەدات.

هیرۆدۆس: هیچی بە تۆ نەوتوە، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەرێکی مەزنە.

هیرۆدیا: من بڕوا بە پێغەمبەر ناکەم. مرۆڤ دەتوانێ بزانێ لە پاشەڕۆژدا چی ڕوودەدات بە کەس نیە ئەمە بزانێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە جوێنم پێدەدات.. بەڵام تۆ وا دەزانم لێی دەترسیت، من دڵنیام کە لێی دەترسیت!.

هیرۆدۆس: لێی ناترسم، وە کەسیش نیە لێی بترسم!

هیرۆدیا: ئەگەر لێی ناترسی بۆچی نایدەیتە دەست ئەو جولەکانەی شەش مانگە داوای دەکەن؟

جولەکەیەك: گەورەم باشتر ئەوەیە بیدەیتە دەستمان.

هیرۆدۆس: ئیتر لەم باسە مەدوێن.. وەرامەکەمتان گوێ لێبوو، و بڕیاوە.. ناتان دەمێ چونکی پێغەمبەرە.. خواشی دیوە.

جولەکەیەك: ئەمە ناکرێ!.. لە ئیلیا پێغەمبەر پتر کەس خوای نەدیوە، دوا کەسە کە خوای دیبێ. خوا لەم ڕۆژانەدا خۆی دەرناخات. خۆی شاردۆتەوە، بۆیە وا خراپەش لە جیهاندا بڵاوبۆتەوە.

جولەکەیەکی تر: لە ڕاستیا کەس نازانێ ئایا ئیلیا پێغەمبەر خوای دیوە یان نەء. ڕەنگە سێبەری خوای دیبێ.

جولەکەی سێهەم: خوا خۆی ناشارێتەوە و هەمیشە لە هەموو شتێکدا خۆی دەردەخات. وەك چۆن خوا لەناو چاکەدا هەیە لەناو خراپەشدا هەیە.

جولەکەی چوارەم: ئەمە مەڵی چونکە وتەیەکی باش نیە.. ئەمە وتەی قوتابخانەی ئەسکەندەریەیە کە فەلسەفەی ئیغریقی تیا دەخوێندرێ، ئیغریقیەکانیش گەلێکی بتپەرست و پیسن.

جولەکەی پێنجەم: کەس نازانێ خوا چۆن ئیش دەکات. ڕێی ئیشەکانی زۆر سەیرە. ڕەنگە ئەو شتانەی پێیان دەڵێین چاکە خراپە بن و ئەو شتانەی پێیان دەڵێین خراپە چاکەبن.. هیچ چەشنە زانینێك نیە. دەبێ سەر بۆ هەموو شتێك دابنەوێنین چونکە خوا مەزنە، ئەو دەتوانێ بەهێز لەگەڵ هێزداردا لەناوبەرێ چونکە گوێ ناداتە مرۆڤ.

جولەکەی شەشەم: قسەکەت تەواوە. خوا ترسناکە، بەهێزو بێهێز وا دەهاڕێ وەك چۆن مرۆڤ دانەوێڵە لە دەسکەواندا دەهاڕێ. بەڵام ئەم پیاوە هەرگیز خوای نەدیوە.

هیرۆدیا: بێدەنگ بە.. بێزارتان کردم.

هیرۆدس: بەڵام بیستومە کە یوحەنا خۆی ئیلیا پێغەمبەرتانە.

جولەکەکە: ئەمە ناشێ پتر لە سێ سەد ساڵ بەسەر ئیلیا پێغەمبەردا ڕابوردوە.

من دڵنیام کە ئەو ئیلیا پێغەمبەرە.

جولەکەکە: نەخێر، ئەو نیە.

دەنگی یوحەنا: بەم جۆرە ڕۆژی خوا هات، وا گوێم لە دەنگی پێی ئەوەیە لەسەر شاخەکان کە دەبێتە ڕزگارکەری مرۆڤ.

هیرۆدۆس: واتای ڕزگارکەری مرۆڤ چیە؟

تیجیلینۆس: ناوێکە لە ناوەکانی قەیسەر.

هیرۆدۆس: بەڵام قەیسەر نایەتە یەهودیە، دوێنێ لە ڕۆماوە نامەم وەرگرتوە ئەم باسە ناکات، ئینجیلینۆی، تۆ خۆشت ئەم زستانە لە ڕۆما بوویت هیچت دەربارەی ئەمە بیستوە؟

ئینجیلینیۆس: هیچم نەبیستوە، گەورەم، تەنها من ئەم ناوەم ڕوونکردیتەوە کە یەکێکە لە ناوەکانی قەیسەر.

هیرۆدۆس: بەڵام قەیسەر ناتوانێ بێت، تووشی باداری بوە، دەشڵێن قاچی وەك قاچی فیلی لێهاتوە. بێجگە لەمەش هۆی تر هەیە بۆ نەهاتنی، هەرچی ڕۆما بەجێبهێڵێت لە دەستی دەچێت.. نایەت.. هەرچی چۆنێ بێت، قەیسەر سەردارەو کەی بیەوێت دێت، لەگەڵ ئەمەشدا بڕوا ناکەم بێت.

یەکەم: گەورەم ئەم وشانەی کە یوحەنا کردی پەیوەندی بە قەیسەرەوە نیە.

هیرۆدۆس: پەیوەندی بە قەیسەرەوە نیە؟

یەکەم: نەخێر گەورەم

هیرۆدۆس: کەوابێ پەیوەندی بە کێوە هەیە؟

یەکەم: پەیوەندی بە مەسیحەوەیە کە هێشتا نەهاتوە.

جولەکەیەك: مەسیح نەهاتوە

یەکەم: هاتوەو لە هەموو جێگایەك شتی واق وڕکەر دەکات..

هیرۆدیا: ها.. ها.. شتی واق وڕکەر.. من بڕوا بە شتی واناکەم. زۆر شتی وام دیوە، (بۆ کارەکەرەکەی) باوەشێنەکەم بێنە

یەکەم: شتە سەیرەکانی ئەم مرۆڤە ڕاستەقینەیە. لە شاییەکی قانای مەزندا ئاوی کردوە بە مەی، لەوانەی دیبویان بۆیان گێڕامەوە، هەروەها دوو گولی تەنها بەدەست لێدان چاك کردۆتەوە کە لەبەر دەرگای کفرناحۆم دانیشتبوون.

دوەم: نەخێر، لە کفرناحۆم کوێری چاك کردبوەوە.



یەکەم: نەخێر، گول بوون.. کوێریشی چاك کردۆتەوە.. لەسەر شاخیش بینراوە قسە لەگەڵ پەریەکانی ئاسماندا بکات.

سروقیەك: پەری ئاسمان نیە

فرەییەك: هەن! بەڵام بڕواناکەم ئەم پیاوە قسەی لەگەڵ کردبن.

یەکەم: زۆر کەس دیویانە لەگەڵیاندا قسە بکات.

سروقیەك: لەگەڵ پەریەکاندا نەء.

هیرۆدیا: ئەم پیاوانە چەند بێزارکەرن! چەند نالەبارن! (بۆ کارەکەرەکەی) باوەشێنەکەم بێنە (باوەشێنەکەی دەداتێ) چاوت دەڵێی خەواڵوە، خەو مەبینە چونکە تەنها نەخۆش خەو دەبینێت (بە باوەشێنەکەی لە کارەکەرەکەی دەدات)دوەم: هەروەها موعجیزەکەی کچی گاریۆسیش!

یەکەم: بەڵێ، ئەمە ڕاستەو کەس ناتوانێ ئینکاری لێبکات!

هیرۆدیا: ئەم پیاوانە کەرن، زۆر سەیری مانگ دەکەن، بڵێ بێدەنگ بن.

هیرۆدۆس: موعجیزەی کچی گاریۆس چیە؟

یەکەم: ئەم کچە مردبوو زیندووی کردەوە.

هیرۆدۆس: مردووش زیندوو دەکاتەوە؟

یەکەم: بەڵێ گەورەم، مردوو لەناو مردوواندا ڕاست دەکاتەوە.

هیرۆدۆس: نامەوێت ئەمە بکات. ناهێڵم بیکات، هیچ کەسێك ناهێڵم مردوو زیندو بکاتەوە. دەبێ بەم پیاوە بڵێن کە مردوو زیندووکردنەوەم قەدەغە کردوە! ئێستا لە کوێیە؟

دوەم: گەورەم لە هەموو شوێنێکە، بەڵام دۆزینەوەی گرانە.

یەکەم: دەڵێن ئێستا لە سامرەیە.

جولەکەیەك: چونکە دەچێتە سامرە مەسیح نیە! مەسیح نایەتە لای سامریەکان چونکە بێزو بۆ لێکراون.. ئەوانە هیچ قوربانی نادەن.

دوەم: چەند ڕۆژێکە سامرەی بەجێهێشتوە، وابزانم ئێستا لە دەوری ئۆرشەلیمە.

یەکەم: نەخێر، لەوێ نیە.. من هەر ئێستا لە ئۆرشەلیم هاتوومەتەوە، دوو مانگە هەواڵی لە خەڵکەکەی بڕاوە.

هیرۆدۆس: خراپ نیە! با بەدوویدا بگەڕێن، ئەگەر دۆزیانەوە با بە زبانی منەوە پێی بڵێن کە لە مردوو زیندووکردنەوە قەدەغەی دەکەم، هەروەها لە ئاوکردن بە مەی و بە چاك کردنەوەی گول و کوێریشدا.. قەیناکات با گول چاك بکاتەوە، چونکە کارێکی مرۆڤایەتیە، بەڵام ناهێڵم مردوو زیندوو بکاتەوە. گەڕانەوەی مردووان زۆر ترسناکە.

دەنگی یۆحەنا: ئای لەو حیزە! ئای لەو دەڵەقۆڕە! ئای لە کچی بابل و چاو، و پێڵوە زێڕینەکانی! خوای مەزن دەڵێ: با مرۆڤ بەرەنگاری بوەستێت و بەردبارانی بکەن.

هیرۆدیا: بابێ دەنگ بێت.

دەنگی یۆحەنا: با فەرماندەرەکانی جەنگ بە شیرەکانیان پارچە پارچەی بکەن و بە زریەکانیان بیهاڕن.

هیرۆدیا: قسەکانی ناڕەوایە!

دەنگی یۆحەنا: بەم جۆرە هەموو گوناە و خراپەیەکی جیهان ناهێڵم، ئەوساش هەموو ژنێك تێدەگات کە پێویستە خۆیان لە خراپە کردن دوور بخەنەوە.

هیرۆدیا: گوێت لێیە چیت پێدەڵێت؟ قایل دەبیت جوێن بە ژنەکەت بدات؟

هیرۆدۆس: ناوی تۆی نەهێناوە!

هیرۆدیا: جا چی تیایە؟ تۆ باش دەزانیت کە بە من دەڵێ، منی ژنت، وانیە

هیرۆدس: لە ڕاستیا خۆشەویستە بە ئابڕووەکەم ژنمیت، لەوەپێشیش ژنی براکەم بوویت.

هیرۆدیا: تۆ بە زۆر لەژێر دەستی دەرت هێنام.

هیرۆدۆس: لە ڕاستیا من لەو بەهێزتر بووم.. بەڵام واز لەم قسانە بێنە، حەزناکەم باسی بکەم. ڕەنگە بە هۆی قسەکانی ئەم پێغەمبەرەوە بەڵایەکمان بەسەرا بێت. هیرۆدیا واز لەم باسە بێنە با خەریکی میوانەکانمان بین. گیانەکەم پەرداخەکەم پڕکە. پەرداخە زیو و شوشەکان پڕکە، لە چاوی قەیسەر دەخۆمەوە، کۆمەڵێك ڕۆمانمان لە ناودایە، دەبێ لە چاوی قەیسەر بخۆینەوە.

هەموو: قەیسەر!.. قەیسەر!..

هیرۆدۆس: هەست بە هەڵبزڕکاوی کچەکەت دەکەیت؟

هیرۆدیا: ئینجا چیته بەسەرەوە؟

هیرۆدۆس: هێشتا وا بە هەڵبزرکاوی نەمدیوە.

هیرۆدیا: ڕووتی لێ وەرگێڕە.

دەنگی یۆحەنا: لەو ڕۆژەدا ڕۆژ ڕەش هەڵدەگەڕێ، مانگ وەك خوێنــی لێــدێ، و ئەســتێرەکان وەك هــەنجیری گــەیو دەکەونــە خوارەوە بۆ سەر زەوی، و پاشاکانی جیهان دێتە لەرزین.

هیرۆدیا: ئاه! ئاه! چەند ئارەزووی بینینــی ئــەو ڕۆژە دەکــەم قسەی لێوە دەکات -کە مانگ وەك خوێنی لێدێت و ئەستێرەکان وەك هــەنجیری گــەیو دەکەونــە ســەر زەوی. ئــەم پێغەمبــەرە وەك سەرخۆش قسە دەکات.. بەڵام توانای گوێ لێگرتنیم نیە، ڕقم لە دەنگیەتی.. بڵی با بێدەنگ بێت.

هیرۆدۆس: ئەمە ناکەم. ناتوانم لە قسەکانی بگەم.. بەڵام دوور نیە نوقڵانەی بەڵایەکی ناڕەوا بێ.

هیرۆدیا: من بڕوا بە بەڵا ناکەم.. وەك سەرخۆش قسە دەکات.

هیرۆدۆس: ڕەنگە بە مەی خوا سەرخۆش بێ.

هیرۆدیا: ئــەم مــەی خوایــە چیــە؟ وە لــەچی ترێیــەك دروســت دەکرێت؟ لە کوێ مرۆڤ دەتوانێ بیدۆزێتەوە؟

هیرۆدۆس: (لە ئێستا بەدواوە ڕوو لە سالۆمی وەرناگێڕێ) پێم بڵــێ ئینجیلینیــۆس، کەلــە ڕومــا بــووی لــەم دواییــەدا ئیمــپراتۆر باسەکەی بۆ نەکردی؟

ئینجیلینۆس: کام باس گەورەم؟

هیرۆدۆس: کام باس؟ ئاه! ئەی لێم نەپرسـیویت، بـیرم چـوو چیت لێبپرسم.

هیرۆدیا: هەر سـەیری کچەکـەم دەکـەی! ڕووی لێوەرگێڕە، زۆر جار ئەمەم پێوتووی.

هیرۆدۆس: لەمە پترت بەدەستەوە نیە بیڵێی؟

هیرۆدیا، دووبارەشی دەکەمەوە.

هیرۆدۆس: زۆریان دەربارەی تازەکردنەوەی پەیکەرەکە قسـە کردوە، هیچیان کردوە؟ ئەڵێن پەردەی رووخستکەگە(2) ون بوە، وانیە؟

هیرۆدیا: تــۆ درزیــت. یــەك تــۆزی تــر نامێنمــەوە.. بــا بچینــە ژووری.

هیرۆدۆس: سالۆمی، سەما بکە!

هیرۆدیا: ناهێڵم سەما بکات..

سالۆمی: گەورەم، ئارەزووی سەمام نیە.

هیرۆدۆس: سالۆمی کچی هیرۆدیا، بۆ من سەما بکە.

هیرۆدیا: لێی گەڕێ.

هیرۆدۆس: دەڵێم سەما بکە، سالۆمی!

سالۆمی: سەما ناکەم،. گەورەم!

هیرۆدیا: (بە پێکەنینەوە) دەبینی چۆن بە قسەت دەکات؟!

هیرۆدۆس: چی لە منە سەما بکات یان نەیکات؟ بیکات یان نەیکات وەك یەکە.. من ئەمشەو دڵخۆشم.. زۆر دڵخۆشم. هێشتا شەوی وا خۆشم نەدیوە.

سەربازی یەکەم: چاوی کوێخا لێڵ بوە، وانیە؟

سەربازی دوەم: بەڵێ، چاوی لێڵە.

هـیرۆدۆس: ئـەی بـۆ دڵۆخـش نـەبم؟ ئـەوە قەیسـەر، گـەورەی جیهان و هەموو مرۆڤ خۆشی دەوێم، وا دیاری بەنرخیشیی بۆ ناردووم، بەڵێنیشی داومەتێ کە شای کابادۆکیای دوژمنم بانگ بکات بۆ ڕۆما، ڕەنگە بە گەیشتنە ڕۆمای چوارمێخەی بکیشــێ، چونکە توانای هەموو شتێکی هەیە. لە ڕاستیا قەیسەر مرۆڤێکی مەزنە، لەبەرئەمە دەبینی شایانمە دڵخۆش بم. بە ڕاستی دڵخۆشم، هێشتا وا دڵخۆش نەبووم، لە جیهانیشدا هیچ نیە کامەرانیە کەم تێك بدات.

دەنگی یۆحەنا: لەسەر ئەم تەختە دادەنیشێ، و مرواری ئاڵی بنەوشەیی دەپۆشێ، پەرداخێکی پڕ لە خراپە و گوناهەکانیشــی بەدەســتەوە دەگرێــت، پــەری خــواش تێــی دەســرەوێنێت، کرمــی زەویش دەیخوات.

هیرۆدیــا: گوێــت لێیــە چیــت پێدەڵــێ! دەڵــێ کرمــی زەوی دەتخوات.

هیرۆدۆس: بە من ناڵێ، هەرگیزیش قسەم پێناڵێت، بە پاشای ئایادۆکیا دەڵێ، بەڵێ، بە دوژمنەکەم، شای ئابادۆکیا. ئەو کرم دەیخوات نەك من. ئەم پێغەمبەرە دەربارەی من نەدواوە ئەوە نەبێ کە وتویەتی گوناهم کردوە براژنەکەم کردوە بە ژنی خۆم ڕەنگیشە ڕاست بکات. لە ڕاستیا تۆ نەزۆکیت.

هیرۆدیا: من نەزۆکم؟ تۆ وا دەڵێی؟ تۆ کە هەر سەیری کچەکەم دەکەیت و پێی دەڵێیت سەما بکات بۆ ڕابواردنی خۆت؟ لە ڕاستیا ئەمە قسـەی قۆڕە دەیکـەی. من هیچ نـەبێ کچێکم بوە، بـەڵام تـۆ کەست لێ نەبوە، هەتا لە کەنیزەکەکانیشت. تۆ نەزۆکیت نەك من.

هـیرۆدۆس: بێدەنـگ بـە ئـافرەت! مـن دەڵێـم تــۆ نــەزۆکیت و منداڵــت لێــم نــەبوە. ئــەم پێغەمبــەرەش دەڵێــت مارەکردنەکــە ڕاستەقینە نیە، بەپێی قسەی ئەو ناڕەواو گوناه و خراپە و توشی بەڵایەکمان دەکات.. دەترسم ڕاست بکات.. دڵنیاشم ڕاستە. بەڵام ئێسـتا کـاتی ئــەم قسـانە نیــە.. ئێســتا دەبــێ کامــەران بم.. لــە ڕاستیشدا کامەرانم و لە هیچم کەم نیە.

هیرۆدیا: ئەمشـەو ڕەوشتم پێی باشە، جاران وا نەبویت.. بـا بچینە ژورێ، درەنگە، بیریشت نەچێت کە بەیانی دەچین بۆ ڕاو. دەبێ باش میوانداری نێرراوەکانی قەیسەر بکەین.. وانیە؟

سەربازی دوەم: چاوی کوێخا چەند لێڵە.

سەربازی یەکەم: بەڵی چاوی لێڵە.

هـیرۆدۆس: سـالۆمی سـەما بکـە، بـەخوا سـوێندت دەدەم کـە سەمام بۆ بکەیت. من ئەمشەو دڵتەنگم، بەڵی ئەمشەو دڵتەنگم. کە

هاتمە پارەوەکە قاچم لە خوێندا خلیسکا، ئەمەش نیشانەیەکی خراپە. دڵنیاشم کە گوێم لە دەنگی جوتە باڵێکی زۆر گەورە بوو، بەڵام ناتوانم ئەمە ڕون بکەمەوە. من ئەمشەو دڵتەنگم، سەمام بۆ بکە. توخوا سالۆمی سەمام بۆ بکە. ئەگەر سەمام بۆ بکەیت هەرچیت بوێ دەتدەمێ ئەگەر نیوەی سامانەکەشم بێ.

سالۆمی: (بەپێوە) بە ڕاستتە هەرچیم بوێت دەمدەیتێ؟

هیرۆدیا: کچم سەماکە!

هیرۆدۆس: بەڵێ هەرچیت دەوێ، هەتا نیوەی سامانەکەشم.

سالۆمی: سوێند دەخۆیت؟

هیرۆدۆس: سوێند دەخۆم!

هیرۆدیا: کچم سەما مەکە.

سالۆمی: گەورەم بەچی سوێند دەخۆیت؟

هیرۆدۆس: بە ژیانم.. بە تاجم.. بە خوام.. هەرچیت بوێت دەسگیرت دەبێت، هەتا نیوەی وڵاتەکەشم، ئەگەر سەمات بۆ کردم.. ئاه! سالۆمی، سەمام بۆ بکە.

سالۆمی: گەورەم سوێندت خوراد.

هیرۆدۆس: سالۆمی، سوێندم خوارد.

سالۆمی: هەمو شتێك داوا دەکەم، هەتا نیوەی وڵاتەکەشت.

هیرۆدیا: کچم سەما مەکە.

هیرۆدۆس: هەتا نیوەی وڵاتەکەشم. تۆ دەبیت بە شاژنێکی مەزن ئەگەر داوای نیوەی وڵاتەکەم بکەیت (بە پرسیارەوە) نابیت بە شاژنێکی مەزن؟ ئاه! ئێرە ساردە.. بایەکی سرکەر دێت بەسەرماندا.. گوێشم لێیە -بۆچی گوێم لە شەقەی باڵە؟ وەك چۆلەکەیەکی ڕەش گەورە بەسەر پارەوە- کەدا بخولێنەوە وایە، بەڵام بۆچی ناتوانم ئەم مەلە ببینم، شەقەی جوت باڵی ترسناکە.. هەواش ساردە.. نەء گەرمە.. دەخنکێم، ئاو بکە بە دەستمدا.. بەفرم بدەنێ بیخۆم.. جلەکانم داکەنن، خێراکەن! نەء، لێم گەڕێن.. چەپکە گوڵەکان ئازارم دەدەن، گوڵیش وەك ئاگر وایە.. ناوچەوانم سوتا. لە چەپکە گوڵەکە لەسەری دادەگرێت فڕێی دەداتە سەر زەوی) ئاه! ئێستا دەتوانم هەناسە بدەم. ئەم گوڵانە چەند سورن. وەك پەڵە خوێنی سەر جل وان. بەڵام خراپ نییە.. نابێ مرۆڤ نیشانەی هەموو شتێك بزانێت ئەگینا ژیان سەخت ئەبێت.. دەبوایە بموتایە کە پەڵە خوێن وەك گوڵی سور وایە. ئەم وتەیە زۆر باشترە.. بەڵام لەمە نادوێین. من کامەرانم.. ئایا مافی ئەوەم نیە کامەران بم؟ کچەکەت سەمام بۆ دەکات، وانیە سالۆمی؟ بەڵێنت داومێ سەمام بۆ بکەیت.

هیرۆدیا: ناهێڵم سەما بکات.

سالۆمی: گەورەم سەمات بۆ دەکەم!

هیرۆدۆس: قسەی کچەکەت گوێ لێیە؟ وا سەمام بۆ دەکات. سالۆمی چاك دەکەی سەمام بۆ دەکەی. بیرت نەچێت داوای ئەوە بکەیت کە دەتەوێت. داواکاریەکەت بەجێدەهێنم ئەگەر نیوەی وڵاتەکەشمت بوێت. سوێندم خواردوە، وانیە؟

سالۆمی: گەورەم، سوێندت خواردوە!

هیرۆدۆسی: هەرگیز سوێندی خۆم نەخستوە، من لەوانە نیم گوێ نادەنە بەڵێن و ژوان. من درۆ نازانم، من نۆکەری وشەکانم، وشەکانیشم وشەی پادشان. پادشای ئابادۆکیا زۆر درۆ دەکات، ئەو پادشایەکی ڕاستەقینە نیە، هەمیشە قەرزارمەو قەرزم ناداتەوە. ئەمەندە ناپیاوە بالیۆزەکانمی زویر کردبو، و قسەی ناڕەوای پێوتبوون. بەڵام قەیسەر بە گەیشتنە ڕۆمای هەڵیدەواسێت. من دڵنیام کە قەیسەر چوارمێخەی دەکێشێت، بەم جۆرەش نەمرێت هەر دەمرێت و کرم دەیخوات. پێغەمبەرەکە ئەم نوقلانەیەی بۆ لێداوە. باشە! سالۆمی چاوەڕێی چیت؟

سالۆمی: چاوەڕێی کەنیزەکەکانم بۆ بێنن و پێڵاوەکانم لەپێ دابکەنن.



هیرۆدۆس: کەواتە بەپێی پەتی سەما دەکەیت. باشە باشە! قاچت وەك کۆتری سپی وایە. وەك گوڵی سپی بەر شەماڵ وایە. نەء،نەء، لەسەر خوێن سەما دەکەیت! وا خوێن لەسەر زەویەکە ڕژاوە. نابێ لەسەر خوێن سەما بکەیت، خراپە.

هیرۆدیا: جاچی تیایە لەسەر خوێن سەما بکات؟ تۆ زۆرت دیوە.

هیرۆدۆس: چی لە منە! سەیری مانگ بکە سور بوە. وەك خوێنی لێهاتوە. ئاه! نوقلانەی پێغەمبەرەکە هاتەدی، نەیوت مانگ سور هەڵدەگەڕێت؟ هەموو گوێتان لەمە بوو. وا سور بوە، نابینن؟

هیرۆدیا: بەڵی دەبینم، دەشبینم ئەستێرەکان وەك هەنجیری گەیو دەکەونە سەر زەوی. وا ڕۆژیش وەك قژ ڕەش هەڵگەڕاوەو شاکانی سەر زەوی دەلەرزن. ئەمە بە ئاسانی دەبینرێت. پێغەمبەرەکە یەك جار لە ژیانیدا ڕاستی وتوە، چونکە شای سەرزەوی ترسنۆکن.. با بچینە ژورەوە، تۆ نەخۆشیت.. لە ڕۆما دەڵێن کە تۆ شێتیت، با بچینە ژوورەوە.

دەنگی یۆحەنا: ئەوە کێیە کە لە ئەدۆم و بەسرەوە هاتوە و جلی ئاڵی بریقەداری لەبەردایە و بە شانازیەوە دەڕوات؟ بۆچی جلەکانت ئاڵ هەڵگەڕاون؟

هیردۆیا: با بچینە ژورەوە، دەنگی ئەم کابرایە دەمترسێنێت. هەتا ئەو بقژێنێت ناهێڵم کچەکەم سەما بکات.

هیرۆدۆس: ژنەکەم و شاژنەکەم مەوەستە، هیچ کەڵك ناگرێت. هەتا سەما نەکات نایەمە ژورەوە. سالۆمی سەمام بۆ بکە، دەی!

هیرۆدیا: کچم سەما مەکە.

سالۆمی: گەورەم ئامادەم!

هیرۆدۆس: ئاه! نایابە! دەبینیت کچەکەت سەمام بۆ دەکات؟ سالۆمی لێم وەرە پێشەوە با خەڵاتەکەتت بدەمێ. من خەڵاتی شاهانە دەدەم بە سەماکەرەکان هەرچیت ئەوێت داوا بکە، قسە بکە.

سالۆمی: (بە چۆکا) دەمەوێت لەسەر سینیەکی زیو..

هیرۆدۆس: (بە پێکەنینەوە) لەسەر سینیەکی زیو؟ بێگومان لەسەر سینیەکی زیو.. چیت لەسەر سینیەکی زیو دەوێت نەشمیلەکەم؟ ئەی جوانترین کچ؟ چیت دەوێت لەسەر سینیەکی زیو بۆتی بهێنن؟.. قسە بکە!.. چیت بوێت بۆت ئامادەیە، سامانەکەم هی تۆیە، سالۆمی داوای چی دەکەیت؟

سالۆمی: (بەپێوە) سەری یۆحەنام بۆ بهێنن!!

هیرۆدیا: چاکت وت کچەکەم!

هیرۆدۆس: نەء،نەء!

هیرۆدیا: چاکت وت کچەکەم!

هیرۆدۆس: نەء، نەء، سالۆمی! داوای ئەمەم لێمەکە، گوێ لە دایکت مەگرە، هەمیشە ئامۆژگاری خراپت دەکات، بە گوێی مەکە.

سالۆمی: من گوێ نادەمە دایکم، داوای سەری یوحەناش لەسەر سینیەکی زیو بۆ ڕابواردن و دڵخۆش بوونی خۆم دەکەم. هیرۆدۆس، سوێندت خواردوە. بیریشت نەچێت کە بەڵێنت داوە!

هیرۆدۆس: دەزانم سوێندم خواردوە. باشە، بەڵام سالۆمی تکات لێ دەکەم داوای شتێکی تر بکە، نیوەی وڵاتەکەمت دەدەمێ بەڵام داوای ئەمەم لێ مەکە!

سالۆمی: من سەری یۆحەنام دەوێت.

هیرۆدۆس: نەء،نەء، ئەمەم ناوێت

سالۆمی: هیرۆدۆس سوێندت خواردوە

هیرۆدیا: بەڵی سوێندت خواردوە و هەمو گوێمان لێبوو.

هیرۆدۆس: بێدەنگ بە، قسە لەگەڵ تۆ ناکەم.

هیرۆدیا: کچەکەم چاکی کرد داوای سەری یۆحەنای کرد. زۆری جوێن پێداوم. دایکی خۆی خۆشدەوێت، کچەکەم پەشیمان نەبیتەوە، سوێندی خواردوە.. سوێندی خواردوە.

هیرۆدۆس: بێدەنگ بەو قسە مەکە.. وەرە سالۆمی و مێشکت هەبێ. هەمیشە تۆم خۆشویستوە، لەبەرئەمە تکات لێدەکەم کە داواکاریەکەت بگۆڕیت چونکە ترسناکە، بەڵام دڵنیام کە گاڵتە دەکەیت.. بینینی سەری بڕاو دڵ تێکەڵ دێنێت، وانیە؟ ناشێ کیژۆڵە چاوی بە سەری بڕاو بکەوێت، چی خۆشیەکی لێدەبینیت؟ هیچ، نەء،نەء، داوای ئەمە ناکەیت. گوێ بگرە.. مرواریەکی گەورەی خڕم هەیە یەکێك لە هاوکارەکانی قەیسەر داویمەتێ. سەیری بکەی لە ماوەیەکی دورەوە شتی پێدەبینیت. قەیسەر خۆی هەرچەند بچێت بۆ سەیری غارغارێن یەکێکی وای پێیە. بەڵام ئەوی من زۆر لەوی ئەو گەورەترە، بەڵکو گەورەترین مرواری جیهانە. حەزی لێناکەیت؟ داوای بکە دەتدەمێ

سالۆمی: سەری یۆحەنام دەوێت!

هیرۆدۆس: گوێت لێنەگرتم.. گوێت نەگرت سالۆمی!

سالۆمی: لەسەری یۆحەنا پتر ناوێت!

هیرۆدۆس: نەء،نەء، نابێ. تۆ بۆیە وا ئەڵێی پەستم بکەیت چونکە بە درێژایی ئاهەنگەکە چاوم تێبڕیبووی. ئەمە ڕاستە.. جوانیەکەت دڵی داخورپاندبوم، زۆرم سەیرکردیت، لەمەودوا وا ناکەم.. مرۆڤ پێویستە لە باتی سەیرکردنی خەڵك و شتی تر هەر سەیری ئاوێنە بکات. ئاه! ئاه! تینومە! مەی بێنن.. سالۆمی بابین بە هاوڕێ. وەرە پێشەوە با باش گوێت لێبێت. تاوسی سپی و جوانم هەیە بە ناودارەکاندا دەگەڕێن.. دەنوکیان زێڕین و قاچیان ئاڵە.. لە دانەوێڵەی بە ئاوی زێڕ شۆراوە پتر ناخۆن، هەرچەندیش بخوێنن باران دەبارێت، ئەگەر باڵیان فش بکەنەوە مانگ هەڵدێت. هەر بە جوتیش لەم دارەوە دەچن بۆ ئەمدار.

هەریەکەشیان نۆکەرێکی هەیە خزمەتی بکات. زۆر جاریش دیوتن لەم دارەوە بفڕن بۆ ئەو دار، یان لەگوێ گوڵەکاندا لێی بکەون. لە جیهاندا مەلی لەوانە جوانتر نیە، هیچ پادشایەکیش لەوانەی نیە. من دڵنیام کە هەتا قەیسەریش لەوانەی نیە پەنجا تاوست دەدەمێ بۆ هەر کوێیەك بچی دوات بکەون، ئەوساش وەك مانگ دەبیت کە پەڵە هەورێکی سپی گەورە دەوری دابێت.. بگرە هەموو مەلەکانمت دەدەمێ، سەد دانەم هەیە، هیچ پادشایەکیش هی وای نیە. واز لەوە بێنە کە داوات کردوە. هەرچی ترت دەوێت هی خۆتە. (پەرداخێك مەی دەخواتەوە).

سالۆمی: سەری یۆحەنام بدەرێ!

هیرۆدیا: چاکت وت کچەم. بەڵام تۆ، بەڵام دا لە خۆت و تاوسەکانت.

هیرۆدۆس: بێدەنگ بە. تۆ هەر قیژەقیژتە، دەنگیشت وەك دەنگی درندە وایە، بەم دەنگە سەرم مەیەشێنە. سالۆمی، بیربکەرەوە. ئەم پیاوە نێراوی خوایەو دەستی خوای بەرکەوتوە. خوا وشەی زۆر ترسناکی خستۆتە سەر زبانی، لە هەموو کاتێکیشدا لەگەڵیەتی، لە بیابان و لە تەلارو لە هەموو شوێنێکدا. لەمە ئاسانتر نیە، بەڵام تالوکەیە، دوریش نیە خوای لەگەڵا بێت. ئەگەر بکوژرێت بەڵایەکی گەورەمان بەسەردا دێت. هەرچی چۆنێك هەبێ وتویەتی کە شتێکی گرنگ لە یەکێك ڕودەدات، ڕەنگە ئەو یەکە من بم. بیرت بکەوێتەوە، کە هاتم بۆ ئێرە قاچم لە خوێندا هەڵخیسکا، هەروەها گوێشم لە شەقەی باڵێکی زەلام بوو. ئەمەش نوقڵانەیەکی خراپە. چەند بەڵگەیەکی تریش هەیە بۆ ڕودانی چەند شتێکی تر هەرچەندە ناشیان بینین. سالۆمی، دەتەوێت بەڵام بەسەرا بێت؟ دیارە ناتەوێت، گوێ بگرە.

سالۆمی: سەری یۆحەنام بدەرێ!

هیرۆدۆس: ئاه! گوێت لێ نەگرتم، هێمن بەرەوەو گوێ بگرە! چەند خشڵێکم هەیە هێشتا دایکت نەیدیون.

خشڵی سەیر سەیر. هەندێکیان ڕستە مرواری چوار قەد بەملدا دێتەوە، وەك مانگی بە تەلی زیو پێکەوە بەسراو وان. وەك پەنجا مانگی ناو زیو وان. یەکێك لە شاژنە نازدارەکان ملی پێ ڕازاندۆتەوە، ئەگەر تۆش بیکەیتە ملت لەو جوانتر دەبیت. دو بەردی (جشتم) هەیە، یەکێکیان وەك مەی ڕەشە، ئەوی تریشیان وەك مەی تێکەڵ بە ئاو سورە. یاقوتێکی زەردی وەك چاوی پڵنگیشم هەیە. هەروەها یاقوتێکی سەوزی وەك چاوی پشیلەشم هەیە. مواریەکی تریشم هەیە ناوی "چاوی پشیلە"یە هەمیشە تیشکێکی لێدەبێتەوە وەك ئەو تیشکەی لە بەفر دەبێتەوە، دەرون سازگار دەکات و تارمایی و تاریکی دەترسێنێت. چەشنە بەردێکی تریشم هەیە پێی دەوترێت جزع وەك چاوی ژنێکی مردوو وایە. بەردە چەخماخێکم هەیە بە گۆڕینی مانگ ئەویش دەگۆڕێت، وە ئەگەر بەر تیشکی ڕۆژ بکەوێت هەڵدەبزرکێت. گۆیەك، و زەبەرجەدێك و عەقیلێکی زەرد و یاقوتێکی زەعفەرانی و بەردی یەمەن و عەقیلێکی زەردم هەیە، هەموویانت دەدەمێ، بگرە لەمانەش پترت دەدەمێ. ئەوە شای دورگەکانی هیند هەر ئێستا چوار باوەشێنی پەری توتی دروست کراوی بۆ ناردوم، شای نۆبیدیاش جلی پەری وشتر مرخی بۆ ناردوم. مرواریەکیشم هەیە نە ئافرەت و نە لاو نابێ سەیری بکەن ئەگینا لێدان دەخۆن. قوتویەکی سەدەفیشم هەیە سێ پیرۆزەی تیایە، ئەگەر مرۆڤ بیخاتە گیرفانیەوە شتی زۆر سەیری دێتە بەرچاو، وە ئەگەر بیخاتە دەستیەوە ژن نەزۆك دەکات، سامانێکی وان کە نرخیان ناژمێررێ. زۆری تریشم هەیە. هەروا بێتەوە، سنوقێکی ئەبەنوسم هەیە دوو پەرداخی کەهرەمانی وەك سێوی زێری تیایە ئەگەر دوژمن زەهرت بۆ تێبکات وەك سێوی زیوینی لێیەت. پێڵاوێکی بە شوشە نەخشراویشم هەیە. چارشێوێکی مەقدۆنیاشم هەیە دەتدەمێ. وە مرواری "دوو ئاوە"ی بە یاقوت داپۆشراویشم هەیە.. ئیتر لەمە پترت چی دەوێت سالۆمی؟ هەرچیت دەوێت دەتدەمێ یەك شت نەبێت. هەرچیم هەیە داوای بکە یەك گیان نەبێت.. کە والی زێوانە گەورەکە و پەردەی ڕوخستەگەکەشت دەدەمێ.

جولەکەکان: ئۆە! ئۆە!

سالۆمی: سەری یۆحەنام بدەرێ.

هیرۆدۆس: (خۆی لە کورسیەکەیدا دەشارێتەوە) چی ئەوێ بیدەنێ! ئەمە پیلانی دایکیەتی! (سەربازی یەکەم دێتە پێشەوە.. هیرۆدیا ئەموستیلەی مردن لە پەنجەی هیرۆدۆس دەردێنێت و دەیدات بە ساربازەکە، ئەویش دەیبات بۆ سەربڕەکە سەربڕەکە بە ترسەوە سەیری دەکات) کێ ئەنگوستیلەکەی بردم؟ ئەموستیلەیەك لە پەنجەی دەستی ڕاستی بوو. کێ مەیەکەی خواردەوە؟ پەرداخەکەم پڕی بوو لە مەی.. ئێوە خواردتانەوە؟ بەڵایەك بەسەر یەکێکدا دێت. (سەربڕەکە دەچێتە لای زیندانەکە). ئاه! بۆچی بەڵێنم دا؟ پاشا پێویستە بەڵێن نەدا چونکە ئەگەر بەڵێنەکەی بەجێهێنا کار ترسناکە، وە ئەگەر بەجێی نەهێنا ترسناکترە.

هیرۆدیا: دەك بەرخواردار بیت کچەکەم.

هیرۆدۆس: من دڵنیام کە بەڵایەك ڕوودەدات.

سالۆمی: (بەسەر زیندانەکەدا شۆڕدەبێتەوە و گوێ دەگرێت) گوێم لە هیچ نیە. بۆچی هاوارناکات؟ ئەم کابرایە بۆ ناقیژێنێت؟ ئەگەر من لە جێی ئەو بومایەو بهاتنایە بمکوژن بە هەموو هێزمەوە ئەمقیژاندو بێئەوەی ئازارم بگات بەرگریم دەکرد. لێدە! لێدە! نەعمان لێدە! ئەم بێدەنگیەی ناو زیندانەکە ترسناکە. وا شتێك کەوتە سەرزەوی، شیری سەربڕەکەیە. ئەم قولە شیرەکەی فرێدا چونکە دەترسێت و ناتوانێت بیکوژێت. سەربازەکان بنێرن. (نۆکەرەکەی هیرۆدیا دەبینێت و قسەی لەگەڵا دەکات) وەرە پێشەوە، تۆ هاوڕێی کوژراوەکەیت، وانیە؟ بڕۆ بە سەربازەکان بڵێ بچنە ناو زیندانەکەوە و ئەوەم بۆ بهێنن کە هیرۆدۆس بەڵێنی پێ داوم. (نۆکەرەکە دەگەڕێتەوە دواوە. سالۆمی ڕوودەکاتە سەربازەکان) وەرن سەربازینە.. بچنە زیندانەکەوەو سەری ئەم پیاوەم بۆ بهێنن (سەربازەکان دەگەڕێنەوە دواوە). گەورەم بە پیاوەکانت بڵێ سەری یۆحەنام بۆ بهێنن (لە زیندانەکەوە باڵە ڕەشە زلەکەی سەربڕەکە دەردەکەوێت، سەری یۆحەنای خستۆتە سەر زریەیەکی زیو. سالۆمی لێی وەردەگرێت. هیرۆدۆس ڕوی بە چمکی جلەکانی دادەپۆشێت.. هیرۆدیا باوەشێنەکەی پێیەو پێدەکەنێت.. نەسرانیەکان کڕنووش دەبەن و دەست بەنوێژکردن دەکەن).

ئاه! یۆحەنا.. ئەوسا نەتهێشت دەمت ماچ بکەم ئێستا ماچی دەکەم. گازی لێدەگرم وەك چۆن مرۆڤ گاز لە سێوێکی گەییو دەگرێت. دمت ماچ دەکەم یۆحەنا. ئەوساش پێم وتیت؟ بەڵێ، ئێستا ماچی دەکەم.. بەڵام یۆحەنا بۆچی سەیرم ناکەیت؟ دوچاوە ترسناکە پڕ لە هەڕەشەکانت داخراون، بۆچی قوچاون؟ یۆحەنا! چاوت بکەرەوەو پێڵوەکانت هەڵبڕە، یۆحەنا، بۆچی سەیرم ناکەیت؟ لێم دەترسیت؟ یۆحەنا دەمیشت وەك مارێکی ژەهراوی سور ژەهرەکەی تێکردم و ئێستا ناجوڵێتەوە. چۆن ئێستا ئەم مارە ئاڵە ناجوڵێتەوە؟ سەیر نیە؟

یۆحەنا، ئەوسا گوێت نەدامێ و پێت دەوتم خراپ، بە منی کچی هیرۆدیاو شازادەی یەهودیە، من، سالۆمی، باشە یۆحەنا، بەڵام ئێستا من زیندوم و تۆ مردوو، سەریشت بوە بە هی خۆم هەرچیم ئارەزوو بێت لێی دەکەم! دەتوانم بیدەم بە سەگ یان بە مەلی ئاسمان.. ئاه. یۆحەنا.. پاشماوەی سەگەکان مەلەکان دەبەن. تۆ یەکەم پیاو بویت خۆشم ویستبێت ڕقم لە هەموو پیاوەکانی ترم بوە. تۆ جوان بوویت و لەشت وەك دارێکی عاجی لە چاڵێکی زیودا چەقیو وابوو، باخچەیەکی ڕازاوەی پڕ لە کۆتری سپی و گوڵپەمووی زیوین بوو.. بارویەکی زیوینی بە زریەی عاج ڕازاوە بوو. لە جیهاندا لە قژت ڕەشتر و لە لێوت سورتر نەبوو. دەنگت بوغوردگە بوو بۆنی هەمەچەشنەو سیری بڵاودەکردەوە هەرچەند سەیرم بکردیتایە مۆسیقایەکی سەیرم دەهاتە گوێ. ئاه! بۆچی سەیرم ناکەیت یۆحەنا؟ لە پشت کارەکانتەوە ڕووت شاردبوەو پەردەی خوا بینینت خستبوە سەرچاوت، بەمە خوات دی، بەڵام منت نەدی، ئەگەر بتدیمایە خۆشت دەویستم.. من تینووی جوانیت و برسی لەشتم.. مەی و میوە تاسەم ناشکێنێت. یۆحەنا چی بکەم؟ نە ئاو، و نە لافاو سۆزم ناشکێنێت.. من شازادە بووم بەڵام تەشقەڵەت پێکردم.. من کچ بووم بەڵام کچێنیەکەمت نەبرد. پاکێکی بێ پەڵە بووم بەڵام دمارەکانمت پڕ نەکرد لە ئاگر.. ئاه! ئاه! بۆچی سەیرت نەکردم! ئەگەر سەیرت بکردمایە خۆشت دەویستم! تەنها ئێستا زانیم کە خۆشت نەویستووم، وە ئێستا تێگەیشتم کە نهێنی دڵداریی و خۆشەویستی لە نهێنی مردن مەزنترە. تەنها دڵداریی شایانی گوێ پێدانە!

هیرۆدۆس: ئای لە درندەیی کچەکەت و نالەباری. لە ڕاستیا ئەوەی کردی تاوانێکی گەورە بوو، دڵنیاشم کە تاوانێکی دەربارەی خوایەکی نەناسراو کردوە.

هیرۆدیا: کچەکەم چاکی کردو منیش لەگەڵیدام.. هەر لێرەش دەمێنمەوە.

هیرۆدۆس: (بەپێوە) ئاه! ئاه! وا ژنە گوناهبارەکە قسە دەکات.. وەرە، لێرە نامێنمەوە.. وەرە.. بەڵایەکی قورس ڕوودەدات. ئێوەش، (مەنسی)، (ئێسکار) و (ئۆزیاس) چراکان بکوژێننەوە.. ناهێڵم چاوم بە هیچ بکەوێت. چراکان بکوژێننەوەو مانگ بشارنەوە و بەری ئەستێرەکان بگرن. هیرۆدیا، لە کۆشکەکەدا خۆمان بشارینەوە! زۆر دەترسم.

(نۆکەرەکان چراکان دەکوژێننەوە. ئەستێرەکان ون دەبن.. پەڵە هەورێکی گەورە بە تەواوی مانگ دادەپۆشێت. تاریکاییەکی ترسناك بەسەر شانۆدا دەشکێت.. هیرۆدۆس بەسەر پەیژەکەدا سەردەکەوێت)

دەنگی سالۆمی: ئاه! دەم ماچ کردی یۆحەنا، دەبڕۆ دەی! دەمم ماچ کردی و هەستم بە تاڵی لێوت کرد.. ئەمە تامی خوێنە؟.. بەڵام ڕەنگیشە تامی دڵداریی تامێکی تاڵی هەیە.. چیمە بەسەر ئەمەوە؟ چیمە بەسەر ئەمەوە؟ من تازە دەمم ماچ کردیت، یۆحەنا!.. (تیشکێکی مانگ دەکەوێتە سەر سالۆمی و ڕوناکی دەکاتەوە).

هیرۆدۆس: (سەیری دەوری خۆی دەکات) ئەم ئافرەتە بکوژن! (سەربازەکان دێنە سەر شانۆکەو بە شیرو زریەکانیان سالۆمی، کچی هیرۆدیاو شازادەی یەهودیە دەهاڕن).

1–بارووو: بورج.

2–ڕووخستگە: محراب (رابەر).



شیعر*

## "کووژەکەی شین"

به ڕەحمەت بێ، نەتکم ئەیوت
کووژەکەی شین بۆ چاوەزارە

تۆی بدیایە بیری ئەگۆڕی
تێئەگەیی
بۆ سنگی تۆی نازدارە

چەندە جوانن، ئەویان شین و
ئەم پەمەیی تێکەڵاون

ئەڵێی دوو یاری پەژمردەن؛
دوای لێک بڕان تێک ئاڵاون

ئەوسا ئەمویست هەرچۆنێ بێ
لێوم بەرگەردنت کەوێ

وەک هەنگی لە گوڵ دابڕاو
کە بە پەرۆشەو ناسرەوێ

بم مژیایە، هەتا گیانم
لەسەر سنگت ئەتوایەوە

جێگای دەمم سپی ئەبوو، و
دیسان خوێن تێی ئەزایەوە

گیانە، ئەوەی ئاواتم بوو
تاسەم لێ شکاو پێی گەییم

دەمم نایە چاڵی ملت،
هەتا هێزم تیابوو مژیم!

ئێستا ئەو کووژەکە شینە
جێگای دەمی گرتوومەوە

توخوا کە هاتی دایماڵە
بالێوی تێ بسوومەوە!

1982/3/18




*بڵاونەکراوەتەوە

# دەوارنشینێکی هندی*

دانەری: ئێرنست هەمەنگوای
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: جەلال تەقی

بەلەمێکی چارۆکەداری تریش لە کەناری زەریاچەکە بەسترابووەوە. وە دوو هیندیە سورەکان وەستابوون و چاوەڕێیان دەکرد.

(نیگ) و باوکی چوونە ناو ئەو بەلەمەوە، لە پشتەوە. دوو هیندیەکانیش پاڵیان پێوە نا بەوەی کە دوو سەوڵەکەیان لە ئاوەکە دا، لە پاشدا یەکێکیان دەستی کرد بە سەوڵ لێدان. (مام جۆرج)یش لە پشتی بەلەمە چارۆکە دارەکەی تر دانیشت، و هەر بەو جۆرە هیندیە لاوەکە پاڵی پێوەناو خۆی کەوتە سەوڵ لێدان.



دوو بەلەمەکان لەژێر باڵی تاریکیدا ڕۆیشتن. "نیگ" گوێی لە دەنگی دوو سەوڵی بەلەمەکەی تر بوو لە ئەڵقەکانیاندا دەسوڕانەوە کە لەناو تەمەکەدا پێشیان کەوت. دوو هیندیەکان سەوڵی تیژیان لێدەداو شەپۆلیان پەیدا دەکرد. "نیگ" پاڵکەوت و دەستی باوکی لە ملیدا. ئەو هیندیەش کە بەلەمەکانی لێدەخوڕی زۆر هەوڵی لەگەڵ سەوڵلێداندا دەدا، بەلام بەلەمەکەی تر لەبەردەمیانەوە، بەناو تەمەکەدا تێدەپەڕی. ناتوانن بیگرنەوە..

(نیگ) پرسی:

-"بابە، بۆ کوێ دەچین؟"

-"بۆ چادری هیندیە سورەکان. ژنێکی هیندی لەوێ زۆر نەخۆشە".

"نیگ" وتی:

-"ئۆە!"

بەناو ئاودڕەکەدا[1] بەلەمەکەی تریان دی گەیشتبوە ڕۆخەکە. (مام جۆرج) لە تاریکیەکەدا جگەرەی دەکێشاو هیندیە لاوەکەش بەلەمەکەی بەسەر لمی ڕۆخەکەدا ڕادەکێشا، (مام جۆرج)یەکی جگەرەیەکیشی دا بە دوو هیندیەکان.

لە ڕۆخەکەوە بەرەو باخە پڕ لە شەونمەکە ڕۆیشتن و شوێن پێی هیندیە لاوەکەیان هەڵدەگرت کە لە پێشینانەوە فانۆزێکی هەڵگرتبوو. لە پاشدا بەناو دارستانەکەدا بەدووی شوێن پێیەکدا ڕۆیشتن گەیاندنیە ڕێگای دارەکە کە بەرەو تەپۆڵکەکە دەڕۆیشت. دنیا لە ئاستی ڕێگای دارەکەدا ڕوناکتر بوو پاش ئەوەی هەموو دارەکانی دەوری بڕرابووەوە. هیندیە لاوەکە وەستا، فانۆزەکەی کوژاندەوە، و هەموو لە سەر ڕۆیشتن ڕۆیشتن.

بە پێچێکدا ڕۆیشت، سەگێك بەرەنگاریان بوو، و پێیان وەڕی. لە پێشیشیانەوە تیشکی قۆختی هیندیە دار ڕونەرەکان هەبوو. سەگی تریشیان بەرەنگار بوو. دوو هیندیەکان کردیاننەوە قۆختەکان. لە قۆختە نزیکەکەی لای ڕێگاکەشەوە تیشکێك لە پەنجەرەیەکدا دیاربوو. ژنێکی پیریش وەستابوو، و چرایەکی بەدەستەوە بوو.

لەناو کوختەکەشدا ژنێکی گەنجی هیندی لەسەر تەختێکی تەختە ڕاکشابوو. دوو ڕۆژی تەواوە خەریکە منداڵی ببێ، هەموو ژنەکانیش یارمەتیان دەدا لەمەدا. بەلام پیاوەکان چووبوونە سەر ڕێگاکە بۆ ئەوەی لەژێر باڵی تاریکیدا دانیشن و دوور لە ناڵاندنیەوە جگەرە بکێشن. هەرکە "نیگ" و دوو هیندیەکان و باوکی و "مام جۆرج" گەیشتنە ناو کۆخەکەوە ناڵاندی. ژنەکە لەسەر تەختە نزیکەکە ڕاکشابوو، و لەژێر لێفەکەوە زۆر ئاوسابوو، و سەری خوار بووبووەوە. مێردەکەیش لەسەر تەختەکەی سەروو بوو، سۆ ڕۆ بوو قاچی بە تەور زۆر بریندار کردبوو. جگەرەیش دەکێشاو ژورەکە بۆندار بوو بوو.

باوکی "بنگ" هەندێك ئاوی داواگرد کە لەسەر کوڕەکە بیکوڵێنێ. لەو کاتەدا کە ئاوەکە ئەکولا باوکەکە قسەی لەگەڵ کوڕەکەیدا کرد، وتی:

-"ئەی نیگ، ئەم ژنە منداڵی دەبێ، کوڕیش دەبێ".

نیگ وتی:

-"دەزانم"

باوکی وتی:

-"تۆ نازانی، گوێ بگرە، ئەمەی ئێستا ئەم ژنە دەیکێشێت پێی دەڵێن ژان گرتن. منداڵەکە دەیەوێ ببێ. هەروەها نەکەش دەئەوێ ببێ. هەموو جومگەکانی لەش هەوڵ دەدات کە منداڵەکە تیشك و ڕوناکی ببینێت. ئەوەش ئەوەیە کە هاوار دەکات و دەناڵێنێت".

"نیگ" وتی:

-"تێگەیشتن".

لێرەدا ژنەکە قیژەیەکی کرد "نیگ".

پرسی:

-"ئۆه، بابە، ناتوانی شتێکی بدەیتێ لەم هاوارە بکەوێ؟".

باوکی وەرامی دایەوە:

-"نەء، هیچ شتێکی سڕکەرم[2] پێ نیە. بەڵام هاوارەکانی گەورەنیە من گوێم لێی نیە چونکە گەورە نیە.

مێردەکە لەسە ڕنوستنگەکە وەرچەرخاو ڕوی کردە دیوارەکە.

ئەو ژنەش کە لە چێشتخانەکە بوو پزیشکەکەی ئاگادار کرد کە ئاوەکە گەرم بوو. باوکی نیگ چوە چێشتخانەکەو نزیکی نیوەی ئاوە کوڵاوەکەی کردە شتێکەوە.

لە پاشدا ئەو ئاوەی لە مەنجەڵەکەدا مابۆوە چەند شتێکی، کە بە دەستەسڕی ژنەکە گرێ درابوو، خستە ناویەوە.

وتی:

-"ئەم شتانە دەبێ بکوڵێنرێن".

دەستی کرد بە دەست شتن لەو ئاوە گەرمەدا کە کردیە شتەکەوە بە پارچەیەك سابون کە لەگەڵ خۆیدا لە چادرەکەدا هێنابووی "نیگ" چاوی لە دەستی باوکی بوو کە پارچە سابونەکەی تیا دەگەڕا. کە دەستی زۆر بەسەرنجەوە دەشت بە کوڕەکەی وت:

-"ئەی نیگ پێویستە لەسەر منداڵە بوەکان لە پێشدا سەریان بکەوێتە خوارێ. بەڵام زۆر جار واناکەن. کە واشیان نەکرد هەموو کەس توشی سزا دەکەن. کێ دەیزانێ، بەڵکو ناچاربم ئەم ژنە عەمەلیات بکەم. بەم زوانە دەیزانین".

کە زانی ئەوا دەستی پاك بۆتەوە هاتە لای نوستنگەی ژنەکەوەو دەستی کرد بە ئیشکردن.

-"ئەم لێفەیە بەرە دواوە، ئەی جۆرج. من ئەمەوێ دەستی لێنەدەم".

کە لەو پاش دەستی کر بە عەمەلیاتەکە مام "جۆرج" و سێ پیاوی هیندی ژنەکەیان گرت کە نەیەڵن بجوڵێتەوە. ئەویش قۆڵی مام جۆرجی گەست، و مام جۆرج وتی:

-"چەند ژنێکی هیندی پیسیت!"

لاوە هیندیەکەی کە مام جۆرجی بە بەلەمەکە هەڵگرتبوو بە گاڵتە پێکردنەوە پێکەنی. "نیگ"یش قاپە پڕ لە ئاوەکەی لەبەردەم باوکیا لابرد. ئەمە هەمووی زۆری خایاند.

باوکیشی منداڵەکەی لە دایکی دەرهێناو دایە دەست ژنە پیرەکەو هەندێك زللەی لێدا بۆ ئەوەی بیهێنێتە هەناسەدان.

وە وتی:

-"دیت ئەی نیگ، کوڕە. دەڵێی چی ببی بە پزیشکێکی یاریدەدەر؟"

"نیگ" وتی:

-"زۆر باشە". سەریشی لارکردبۆوە بۆ ئەوەی بزانێ باوکی چی دەکات.

باوکی وتی:

-"سەیرکە. ئەمەیە هەموو هۆیەکەی!".

شتێکی خستە قاپەکەو..

"نیگ" سەیری ئەو شتەی نەکرد.

باوکی وتی:

-"ئێستا دەبێ چەند کونێکی تێبکەم. ئەی نیگ، دەتوانی سەیری بکەیت یان نەیکەیت. چۆنت پێ باشە وا بکە. لە پاشدا ئەو دەلاقەیە کە لە لەشمیدا کرد.

نیگ سەیری هیچی نەکرد

دەمێك

باوکی ئیشەکەی تەواوکردو هەستا، مام جۆرج و پیاوە هیندیەکانیش هەستان، نیگیش قاپەکەی برد بۆ چێشتخانەکە.

مام جۆرج سەیری قۆڵی کردو لاوە هیندیەکەش کە کارەساتەکەی بیرکەوتەوە زەردەخەنەیەك گرتی.

پزیشکەکە وتی:

-"جۆرج، کەمێك (پیرۆکساید)یی ئەفەمەسەر".

بەسەر ژنە هیندیەکەدا نوشتایەوە؛ ژنەکە بێدەنگ بوو، و چاوی داخرابوو. ڕەنگی زۆر هەڵبزڕکابوو، وە نەیزانیبو چی بە سەر منداڵەکە هاتوە.

پزیشکەکە هەستاو وتی:

-"بەیانی دێمەوە. ژنەکە خۆشەوانەکەش بێشك، نیوەڕۆ لە سانت ئیگناسەوە دێت و چیمان پێویست بێ بۆمان دێت".

باوەڕی بە سەرکەوتنی خۆی هەبوو. حەزی لە قسەکرد وەك یاریکەرەکانی (تۆپی شەق) کە پاش تەواوبوونی یاری ئەچنە ژوری جلەکانیان.

وتی:

-"ئەی جۆرج ئەمە وتاریکە لە گۆڤاری پزیشکیدا بڵاودەکرێتەوە. عەمەلیات کردنی (کایسارینی) بە چەقۆیەکی گیرفانی گەروەو درونەوەی برینەکە بە تولێکی ڕیخۆڵەی باریك کراو کە سەری قولاپی ماسیگرتن پێ ئەگیری، و درێژی نۆ پێیە دوراوەتەوە".

مام جۆرج چۆکی دادابوە سەر دیوارەکەو دەیڕوانیە دەستی. وتی:

-"ئۆە، تۆ پیاوێکی مەزنیت، گومان لەوەدا نیە".

-"دەبێ سەیرێکی باوکە ناز کەرەکە بکەین. باوکان، زۆرجار، لەم شتە بچوکانەدا ئازاری زۆر دەکێشن. پێویستە بڵێم باش خۆی ڕاگرتوە.

سەری ژنە هیندیەکەی لادا و دەستە تەڕەکەی دەرهێنا. خۆشی لەسەر لێواری نوستنگە نزیکەکە دانیشت، چراکەش بە دەستێکیەوە بوو، و سەیری کرد.

پیاوە هیندیە سورەکە رووی کردبوە دیوارەکەو گەرووك گوشاو گۆش لێکبووبوەوە. و لەو شوێنەدا کە لەشی خستبوە سەر نوێنەکە خوێن گۆلیی بەستبوو. سەری خستبوە سەر باڵی ڕاستی و گوێزانە کراوەکە لەسەر نوێنەکە فڕێ درابوو، و سەرەکەی کرابوە سەرەوە.

پزیشکەکە وتی:

-"ئەی جۆرج، نیگ لە قۆختەکە بەرە دەرێ".

پێویستی بەوە نەدەکرد. نیگ لە دەرگای چێشتخانەکە ڕاوەستابوو، و بە باشی نوستنگەکەی ژووروی ئەدی لەو کاتەدا کە باوکی هاتە پێشەوە، چراکەشی پێبوو، و سەری هیندیە سورەکەی خستەوە پشتەوە.

ڕۆژ خەریك بوو هەڵبێت لەوکاتەدا کە دەستیان بە ڕۆیشتن کردەوە، لە ڕێی دارەکەوە، بەرەو رووی زەریاچەکە.

عەمەلیاتەکە توشی بووبوو، وتی:

-"ئەی نیگ، زۆر بە داخەوەم کە لەگەڵ خۆمدا هێنامیت. ئەمە گێژاوێکی ترسناکە "ئەبوایە لێم دوور بخستیتایەوە".

نیگ لێی پرسی:

-"هەموو ژنێك ئەم هەموو سزاو سەریەشەیە دەکێشێت کە منداڵی دەبێ؟".

-"نەء. ئەم منداڵ بوونە جیابوو. زۆر جیاواز بوو".

-"بابە، بۆچی خۆی کوشت؟؟"

-"ئەی نیگ، نازانم، وابزانم نەیتوانی ئارام لەسەر ئەو ماڵە بگرێ".

-"بابە، زۆر کەس خۆی دەکوژێ؟".

-"ئەی نیگ، کەمیان وا دەکەن".

-"ئەی زۆر ژن خۆیان دەکوژن؟"

-"ئەوان بە دەگمەن نەبێ وا ناکەن".

-"مەبەستت لەوەیە کە ئەوان هەرگیز ئەوە ناکەن؟".

-بەڵێ، ئۆە. ئەوان هەندێك جار ئەوە دەکەن".

-"بابە؟".

-"بەڵێ".

-"مام جۆرج بۆ کوێ چوو؟؟

-هەر ئیستا دێتەوە."

-"بابە، مردن گرانە؟"



-"نەء. من زۆر بە ئاسانی دەزانم. ئەمە بە پێی کات و کارەساتە".

هەردووکیان سواری بەلەمەکە بووبوون. نیگ لە پشتەوە بوو، و باوکی سەوڵی لێدەدا. ڕۆژ لەسەرروو تەپۆڵکەکانەوە هەڵدەهات. (باس)ەکانیش[3] خۆیان دەکرد بە ئاوەکەدا. نیگ دەستی کرد بە ئاوەکەدا، لەو بەیانیە ساردەدا گەرم دیاربوو.

لەو بەیانیەدا، باوکی لەسەر پەڕەکانی زەریاچەکە سەوڵی لێدەدا، نیگیش لە پشتەوە دانیشتبوو و پێی وابوو، و هەستی دەکرد کە هەرگیز نامرێت.

**پەراوێزەکان:**

1-ئاودڕ: خلیج.

2-سڕکەر: مخدر.

3-باس: چەشنە ماسیەکە.

*دەستنووس

# بیرەوەری کارەساتەکە

جەلال تەقی

نووسراوی ئاینی و ئەفسانەی گەلان، لە ڕاستیدا، کۆنترین سەرچاوەی مێژوون کە پێمان گەیشتوە. هەندێك دۆزینەوەی ئەم ساڵانەی دواییە زۆر ڕاستی وایان سەلماندوە کە لەوەپێش تەنها لە ئەفسانەو پەڕاوە ئاینییەکاندا باس کرابوون. ئەمەش شتێکی سەیر نیە؛ چونکە (پەڕاوە پیرۆزەکان) و ئەفسانە ئاینییەکان کە یادگارە کۆنەکانیان کۆکردۆتەوە بەمە هەندێك ڕووداوی ڕاستەقینەی گەلانیان پاراستوە. ف. ئەنگلس ئەڵمی کە ئەو شتانەی دەماودەم لە گەلانی ڕابوردوەوە گێڕاونەتەوە (هۆیەکی سەرەکین بۆ ڕاست کردنەی زانیاری دووبارەی کەرەستەی مێژوویی و دیاریکردنی یەك بە دوای یەکدا هاتنیان، بۆیە مێژوو نووس پێویستە هەوڵی ئەوە بدات کە لە چیرۆکی دەماودەم و سەرچاوە ئاینییەکاندا ئەو مەبەستانە بدۆزێتەوە کە بتوانرێ بکرێن بە بنچینەی زانیاری).

هەر بەم شێوەیە، بۆ وێنە؛ (گ. شلیمان)ی زانای ئارکیولۆجی ئەڵمانی بە هۆی وردبوونەوەو لێکۆڵینەوە لە چەند دێڕێکی نادیاری هەڵبەستەکانی (ئەلیادە)ی (هۆمیرۆس) توانی شوێنەواری شاری (تەڕوادە)ی ئەفسانەیی بدۆزێتەوە سەرلەنوێ کەلاوەکانی بخاتەوە بەر تیشکی ڕووناکی و ئەو تەروادەیەی کە هەتا ئەوکاتە بە ئەنجامی بیرێکی لە خەیاڵدا دروستکراو




دائەنرا بکات بە ڕاستیەکی ون نەبوو. هەر بەم جۆرەش زاناکان توانیویانە بە هۆی تاڵە دەزووی باسکراوەوە لە ئەفسانەی کۆن و سەرچاوە ئاینییەکاندا شارستانیەتی فراوانی ونبوو بدۆزنەوە.

نووسراوی سەر خشتە قوڕەکانی "سۆمەر" ناوی پێنج شاریان هێناوە: ئەریدۆ، باس تیبرا، لاراك، سیپارو شوروپاك، کە گوایا پێش کارەساتی لافاوەکە هەبوون. ئەگەر بهاتایەو بوونی "لافاوەکە" بە خەیاڵێك دابنرایە ئەبوایە ئەم شارانەش هەر بە خەیاڵ بژمێردرانایە، ئەوساش زانایانی ئارکیۆلۆجی نەیاندەتوانی سی شار لەم شارانە بدۆزنەوە: ئەریدۆ، سیپار و شوروپاك. بێجگە لەمەش، لە هەمان شوێندا شوێنەواری لافاوێکی زۆر بەهێز بینراوە کە ئەوکاتە داویە لەم ناوچانە. ئەمە بۆتە بنچینە بۆ ئەوەی زانایان بێ ترس پێشنیاری بوونی ئەو لافاوە جیهانیە قوبوڵ بکەن کە نوسراوە سۆمەریەکان و چیرۆکەکانی ئینجیل باسیان کردوە.

لە ئینجیلدا ئەم دێڕانە ئەخوێنینەوە: (لە حەوتەم ڕۆژی مانگی دووهەمدا هەموو سەرچاوەی ئاوی ئاسمان کرایەوەو چل شەو و چل ڕۆژ لەسەر یەك باران باری).

هەزار ساڵێك پێش ئەم دێڕانە لە نووسراوە سۆمەریەکاندا ئەمە دەخوێنینەوە: (سەرلەبەیانی ئاسمان شێواو شەو ڕەهێڵەیەکی وا بەسام دایکرد نەدەتوانرا سەیری بکرێ. ڕۆژی یەکەم بای باشوری هەڵیکرد و شاخ و دۆڵەکانی پڕ کردو وەك جەنگ دای بەسەر خەڵکیدا و وای لێهات چاو چاوی نەدەبینی).

هەروەك لە ئینجیلدا، لێرەشدا مەبەست لەو لافاوەیە کە هێرشی هێنایە سەر مرۆڤایەتی و لەناوی برد.

ئەو کارەساتەی زۆربەی مرۆڤایەتی و ژیانی لەسەر زەوی لەناو برد هەر تەنها لەم ناوچانەدا باس نەکراوە. هەواڵی ئەمە لە پەڕاوە ئاینیە میسریەکان و سانسکریتیەکان و هیندیەکان و لای گەلانی ئۆقیانوسی "هێمن" و هەردوو ئەمەرکادا بڵاو و باسکراوە. هەروەها هەندێك وێنەو نیگاری کۆنی ئەم ڕووداوەشمان پێگەیشتوە، وەك وێنەی –

1–ی "ئاتسی"یەکان و وێنە -2–ی بابلی کۆن.

(ج. فریزەر)ی زانای ئینگلیزی کە باسی "ئیقلیم گیری"[1] ئەم کارەساتە دەکات دەڵێ کە ئەفسانەی ئەو (130) تیرە هیندیانەی لە سەروو، و ناوەڕاست و خوارووی ئەمەریکا دەژین یەکێکیان نیە باسی ئەم لافاوەی تێدا نەبێ.

پەڕاوی (چیماڵپۆپۆک)ی مەکسیکی کۆن لەم بارەیەوە دەڵێ: (ئاسمان لە زەوی نزیک بوەوەو بە یەک ڕۆژ هەموو گیانلەبەری سەر زەوی مردن و شاخ و کێوەکانیش ئاودایپۆشین.. دەشڵێن ئەو تاشە بەردانەی ئێستا دەیانبینین ئەوسا هەموو زەوی داپۆشیبوو و دەکوڵان و هاژەو گڕی شانە سورەکان بەرز دەبوونەوە).

لە پەڕاوی (پۆپۆل ڤووخ)دا کە سەرۆکی ئاینیە هیندیەکانی (کیچی)– کە نەوەکانیان ئێستا لە گواتیمالا دەژین نووسیویانە– بەم جۆرە دەربارەی ئەم کارەساتە دەدوێ: (ڕووی زەوی تاریک بوو. و بارانێکی ڕەش بێ وەستان شەوو ڕۆژ باری.. و لافاوێکی گەورە هەستا. خەڵک حەپەسان و بە یەکدا دەهاتن.. دەچوونە سەر بانی خانوەکانیان بۆ ئەوەی خۆیان ڕزگاربکەن بەڵام خانوەکان دەڕوخان و دەیانخستنە ئاوەکەوە، دەچوونە سەردارەکان، دارەکان دەشکانەوە.. خۆیان لە ئەشکەوت و سەر شاخەکاندا دەشاردەوە ئاوەکە دەیانگەیشتێ و دەیکوشتن.. بەم جۆرە مرۆڤی سەر زەوی، کە بڕیار درابوو نەمێنن، لەناوچوون..).

یادی ئەم کارەساتە لەناو هندیە سورەکانی گۆمی (ئامەزۆن)یشدا ماوە: (لەپڕ ڕۆژێک زەوی گرماندی و تروسکایی ڕووناکی نەما، و پاش ئەمە باران و ڕەهێڵە و لافاوێکی بەهێز هەموو زەوی داپۆشی).

ئەفسانەیەکی بەرازیلی دەڵێ: (ڕەهێڵەو تاریکی ماوەیەکی زۆری خایاند، ئاو ئەوەندە بەرزبوەوە هەموو شتێکی سەر ڕووی زەوی داپۆشی.. خەڵک لە تاودا نەیاندەزانی چی بکەن و دەچوونە سەربەرزترین درەخت و شاخەکان).

هەر لەو کاتەدا، لەوە دەچێ، لە هەندێک شوێندا شاخ پەیدابووبێ. ئەفسانەی هیندیەکانی دورگەی (شارلوت) دەڵێ: (پێش لافاوەکە زەوی بەم جۆرەی ئێستا نەبوو، و شاخ پەیدا نەبووبوو). ئەوە بوو لە پەڕاوی (چیمالپۆپک)یشدا بینیمان کە دەڵێ:



(شاخ سورەکان دەکوڵان) ئەمەش ڕەنگە مەبەستی لەو ئاگرو مەعدەنە تواوانە بێ کە بورکانە تەقیوەکان فڕێیان دەدان.

هەواڵی هەمان لافاو، کە بوومەلەرزەو ڕەهێڵەو گەرداو و تەقینەوەی بورکانی لەگەڵ بوە لە ئەفسانەی گەلانی ئەفەریقاشدا هەتا ئێستا هەر ماوە.. لەوەش ئەچێ مەبەستیان کارەساتێک بووبێ کە لە نێوان ئەمەریکاو ئەفەریقادا ڕووی دابێ. بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە کە هەتا لە (ئەتڵەسی) دوور بکەوینەوە شێوەو ناوەڕۆکی ئەم ئەفسانانە دەگۆڕێ و کارەساتەکە هێزی کەمتر دەبێ، هەتا وای لێدێ لە هەندێ جێگادا تەنها باسی لافاوەو هیچی تر. بۆ وێنە، لەناو هیندیە سورەکانی تیرەی (تلینگیت)ی ئالاسکادا تەنها باسی لافاو دەگرێ. لێرە خەڵکەکە ڕایان کردۆتە سەر شاخەکان و لە ئاوەکە دوور کەوتوونەتەوەو ورچ و گورگ بێ ترس بەرەو خەڵکەکە مەلەیان کردوەو ناچار بە ڕم لە خۆیان دوور خۆستونەتەوە.

لە ئەمەریکای خوارووش هەمان شێوە دووبارە دەبێتەوە. دانیشتوان لە ترسی لافاو چوونەتە سەر شاخەکان و خۆیان ڕزگار کردوە.

ئەگەر بە خەیاڵ لە چەقی کارەساتەکەوە بەرەو ڕۆژهەڵات، بەناو زەریای سپی ناوەڕاست و ئێراندا بڕۆین و بگەینە چین دەبینین بەرەبەرە شێوەو هێزی لافاوەکە دەگۆڕێ. بۆ وێنە ئەفسانە یۆنانیەکان دەڵێن کە لە کاتی لافاوەکەدا هەموو زەوی (دەلەرزی)، هەبوو ڕایاندەکردە سەر شاخەکان و هەشبوو سواری بەلەم دەبوون و بە سەوڵلێدان بەو جێگایانەدا دەڕۆیشتن کە پێش ئەمە کێلابوویان، هەشبوو ماسی لەسەر دەوەنەکان کۆدەکردەوە.

وەك دەبینین. لەم ناوچەیەدا تەنها بوومەلەرزە ڕوویداوە و لەسەری هەندێك درەخت بەرزتر نەبۆتەوە.

لە پەڕاوی پیرۆزی (زەند-ئاوێستا)ی ئێرانیە كۆنەكاندا دەڵێ كە (لە كاتی لافاوەكەدا ئاو هێندەی بالای مرۆڤێك بەرزبووبووەوە).

ئەفسانەی خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو چین دەڵێ كە ئاوی زەریا پاش ئەوەی هێرشی هێنا بەسەر ڕۆخەكان لە دواییدا بەرەو خوارووی ڕۆژهەلات كشایەوە.

ئەمەش گومانی تێدا نیە كە ئەگەر لە لایەكی سەرزەوی لافاو هێندەی شاخێك بەرزبووبێتەوە دەبێ لە لایەكەی تری سەر زەویدا نزم بووبێتەوەو كشابێتەوە بەرەو ئەولایەی ئاوەكەی لێ بەرزبۆتەوە. بۆیە هەتا بەرەو ڕۆژهەلات بڕۆین هەواڵی نزمبوونەوەی ئاو دەبیسین.. هەر لەبەر ئەمەشە كە لە ئەمەریكای ناوەڕاستدا ئاو هەتا بەرزترین لوتكەی شاخ گەیشتوە و لە یۆناندا هەتا سەر دەوەنەكان و لە ئێراندا بالای زەلامێك بەرز بۆتەوە.

ئا ئەمەیە ئەو نەخشە تێكڕاییەی كە لە ئەفسانەی زۆربەی گەلاندا هەیە. ئەوەی سەرنج ڕاكێشی ئەوەیە كە ئەم هەواڵە لە زۆربەی ئەفسانەی ئەو گەلانەدا كە هەزارەها كیلۆمەتر لە یەك دوورن زۆر لەیەك دەچن، بۆ وێنە لە هەموویاندا (یەكێك) ئاگاداری دانیشتوان دەكات كە كارەساتێك ڕوودەدات. لە داستانی بابلیدا خواوەند (ئێیا) شا (كسیسۆترۆس) ئاگادار دەكات و پێی دەڵێ: (ئەی كوڕی ئووبارا تووتوو، خانوەكەت بڕووخێنەو كەشتیەك دروست بكە، گوێ مەدەرە كەلوپەل و سامانت، و خۆت ڕزگار كە، بەلام بیرت نەچێ، گیانلەبەری جیاجیا لەگەڵ خۆت هەڵگرە).

خوای (ئاتسی)یەكانیش هەر بەم شێوەیە دەدوێ: (ئیتر خۆت بەمەی دروست كردنەوە خەریك مەكە و لە قەدی درەختێكی گەورە بەلەمێك دروست بكە چونكە لە مانگی تۆزو نتلیدا ئاو دەگاتە بەرزایی ئاسمان).

لە ئینجیلیشدا خوا (نوح) لەم بەلایە ئاگادار دەكات[6] هەر بەم جۆرەش (ڤیشنوو)ی خوای هیندیە سورەكان مرۆڤایەتی لەم بەلایە ئاگادار دەكات.

لە دورگەكانی ئۆقیانووسی (هێمن)یشدا جۆرەها ئەفسانە هەیە كە گوایا ئەوەی لە لافاوەكەدا بەلەم و كەشتی دروست كردبوو ڕزگاری بوو و ئەوانی تر خنكان.

ئەفسانەیەكی نوسراوی (بیرما) باسی مرۆڤێكی (ڕەشپۆش) دەكات كە لە (جیهانێكی ترەوە هاتبوو و بەناو خەڵكدا دەگەڕاو بە دەنگێكی كاریگەر لەو بەلایە ئاگاداری دەكردن.

بەڵگەیەكی تری (ئیقلیم گیریەتی) ئەم كارەساتە ئەوەیە كە لە هەموو ئەفسانەكاندا (ژن و پیاو) و هەندێك جار منداڵەكانیان ئاگاداری ئەم بەلایە كراون. بۆ وێنە: لە ئینجیلدا (نوح) و ژنەكەی، لە ئەفسانەی ئیرلەندی كۆندا (پیت) و لە ئەفسانەی یۆنانی كۆندا (دیڤكالیۆن) و (پیرا) و لە وێلز (دیوڤین) و (دیوێڤیچ) بەرچاودەكەون. هەمان وێنە لەودیو (ئەتڵەسی)دا، لەناو (ئاتسی) و هیندیە سورەكانی بەرازیل و سەرووی ئەمەریكادا دووبارە دەبێتەوە.

شتێكی تر، هەموو ئەوانەی ئاگاداری ئەم كارەساتە كراون پێیان وتراوە كە گیانلەبەری هەمەچەشنە لەگەڵ خۆیان ڕزگار بكەن "نوح"ی "ئینجیل" و "ناتا"ی مەكسیكی كۆن و "ئیتسی" هیندیەكانی كەنەداو "مانو"ی هیندی و "تڕۆو"ی یرۆنیو و "كسیسۆترۆس"ی سۆرمەی - هەر یەكێك لەمانە- هەروایان كردوە!

پاش نیشتنەوەی ئاوی لافاوەكە خەڵكەكە لەسەر "لوتكەی یەكەم شاخ" دادەبەزن كە دەردەكەوێ!

لە داستانی "گەلگامیش"دا كەشتیەكە لەسەر لوتكەی شاخی "ناتسیر" و كەشتیەكەی نوح لەسەر لوتكەی شاخی "ئارارات" و "كەشتیەكەی "دیڤكالیۆ"ی یۆنانی لەسەر لوتكەی شاخی "ئۆفریس" (یان پارناس) و كەشتیە دانیتشوانی (ڤایتی) لەسەر لوتكەی شاخی (پیتۆخیتۆ) دەگیرسێتەوە،

زۆر حالی تری لەیەكچوو هەیە كە ناتوانین هۆیەكانیان ڕوون بكەینەوە: (نوح) بۆ ئەوەی بزانێ ئایا لافاوەكە نیشتۆتەوە یان نەء ناوبەناو (باڵندە) یەك دەنێرێ. سێ جار باڵندەی ناردو كە لە سێهەم جاردا گەڕایەوە چڵە زەیتوونێكی بە دەنوكەوە بوو -ئەمەش نیشانەی كەمبوونەوەی ئاو بوو.

پالەوانی ڕزگاربووی سۆمەریش، كە زۆر لە نوح كۆنترە، بە هەمان شێوە باڵندەی نارد كە بزانێ زەوی دەركەتوە یان نە.. پالەوانی هیندیەكانی "وێست ئینديا" و ناوەڕاست و سەرووی ئەمەریكاش هەروایان كردو باڵندەكان چڵێ درەختیان بۆ هێنان وەك بەڵگەی دەركەوتنی زەوی.

دوو هەزار ساڵ پترە لە ئیجلیدا باسی دەركەوتنی پەلكەزێڕینە دەخوێندرێتەوە كە بە نیشانەی تەواوبوونی "لافاوەكە" دەژمێردرێ. لەسەر خشتە قوڕەكانی سۆمەریش هەمان شت باسكراوە. ئەی بۆچی هەمان هەواڵ لە پەڕاوە ئاینی و ئەفسانە كۆنەكانی ئەمەریكاو پۆلۆنیزیشادا هەیە؟ هەروەك لافاوەكەی ئینجیل و سۆمەریە كۆنەكان لە ئەفسانەی ئەمەریكاو دورگەكانی ئۆقیانووسی "هێمن"یشدا پەلكەزێڕنە نیشانەی تەواوبوونی لافاوەكەیە.

لەمەش سەیرتر دەركەوتنی "ئاگرە".

لە ئەفسانەی "ئاتستیك"ەكانی مەكسیكدا "تێلاكاخوان"ی خواوەندی كە "ناتاو ژنەكەی ئاگادار كرد كەشتی

# دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودو سمکۆ

**عەتا قەرەداخی**

(دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمود و سمکۆ) کتێبێکی چاپکراوی نووسەری خولێخۆشبوو ئەندازیار جەلال تەقیە، ئەم کتێبە گەوهەرەکەی بیرەوەرییەکانی ئەحمەد تەقییەو مامۆستا جەلال تەقی ئامادەی کردووەو پەراوێزی بۆ نووسیووە، بێگومان ئەمەش ئەو ڕاستیە ئاشکرا دەکات کە مامۆستا جەلال تەقی سەرباری خەریکبوونی بەردەوامی بە کاری وەرگێڕان و نووسینی ناوبەناوی خۆیشیەوە، هەوڵیداوە لەو بوارانەی مێژوویشدا کە پەیوەندییان بە نەتەوەکەیەوە هەیە بەپێی توانای خۆی خزمەت بکات. دیارە ئەمەش بەڵگەی سەلمێنەری ئەو ڕاستیەیە کە جەلال تەقی زانیویەتی بایەخی مێژوو چیەو بۆ نەتەوەیەکی بێ ناسنامەی دانپێدانراو و بێ دەوڵەتی وەکو کوردیش مێژوو دەبێتە ئەو سەرچاوەیەی کە وەکو یەکێك لە پایەکانی کەلتور دەشێ بنەمای ڕێنسانسی نەتەوەیی بێت. لێرەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە جەلال تەقی ئەو نووسەرو وەرگێڕە هۆشیارەی کوردە کە بایەخی ڕەگەزو پایەکانی ڕۆشنبیری و کەلتوری نەتەوەکەی بە چاکی تێدەگات و دەزانێت بۆ بە دەستهێنانی ئایندە چ بایەخێکیان هەیە.

ئەم کتێبەی مامۆستا جەلال تەقی کە بریتیە لە ئامادەکردن و پەراوێز بۆ نووسینی بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی لەبارەی گرنگترین ڕاپەڕینەکانی کوردەوەیە کە ئەویش (ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحمودی بەرزنجی و هاتنی سمکۆی شکاك. ئەحمەد تەقی کە وەکو خۆی نووسیویەتی لە سالی (1310) کۆچیدا لە دایکبووەو لە جەنگی جیهانی یەکەمدا چوەتە ڕیزی سوپای عوسمانیەوەو چۆتە شام و پاشان وان و دوایش هەتا کۆتایی هاتنی جەنگ لە ئەرزرۆم ماوەتەوە. پاشان گەڕاوەتەوە بۆ




سلێمانی، ئەحمەد تەقی هاوچەرخی ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحود و سمایل خانی شکاك بووەو یەکێك بووە لەو پیاوە وریاو هۆشیارانەی کە بیرەوەریەکانی خۆی لەبارەی ئەوەی دیویەتی یان لە سەردەمی ئەودا ڕوویداوە نووسیووە. ئەحمەد تەقی دەڵێت: با بڵێین شێخ مەحموودو کوردەکان تەفرەدراوی دەستی ئەوان بوون و بۆیە ئینگلیز ئیعتیمادی پێ نەکردوون" مەبەستی ئەحمەد تەقی لە ئەوان تورکەکانەو لەم دەستپێکەشدا دەردەکەوێت کە ڕەخنە لە هەڵوێستی ئینگلیز دەگرێت کە بڕوایان بە کوردەکان نەکردووەو بەو چاوە سەیریان کردون کە نەك هەر لایەنگری تورکەکانن بەڵکو تەفرەدراوی ئەوانیشن بە دژی ئینگلیزو بەرژەوەندییەکانی، هەر لێرەشدا باسی ئەوە دەکات کە چۆن کوردەکان بە حاکمێتی ئینگلیز ناڕازی بوون و چۆن لە خواروی کوردستان بە سەرکردایەتی شێخ مەحموودی حەفید دەستیان دایە ڕاپەڕین دژی بەرژەوەندی و دەسەلاتی ئینگلیزو لەو سەروبەندەشدا کوردەکان پێشڕەوایەتی هێزەکانی تورکیان کرد بۆ ناوچەی ڕەواندوزو پشدەرو ڕانیە. ئەوەتا دەڵێت "کوردەکان بە عمومی هاتنە حرکت و ثەورە بەرامبەر ئیدارەی حاکمە سیاسیەکانی انکلیز بە تکلف و مراجعتێکی زۆر قوەتی تورك یان هێنایە سەر ڕەواندوزو پشدەر و ڕانیە- بیرەوەریەکان ل 8). ئەم ڕاپەڕینانە مەترسی لەلای ئینگلیز دروستکرد، پێشتر کە لەبەر دژایەتی کردنی ئینگلیز و لایەنگیری کردنی تورکەکان، ئینگلیز شێخ مەحمودی ڕەوانەی ئەسارەت کردبوو، بە ناچاری هێنایەوە سلێمانی، بەلام هیچ شتێکی وای بۆ شێخ مەحمودو کوردەکان نەکرد بەڵکو هەموو هەواڵی ئینگلیز ئەوە بوو کە شێخ مەحموود کوردەکان بکات بە گژ تورکەکاندا.

ئەحمەد تەقی پێی وایە کە ئینگلیز خەریکی بەرژەوەندییەکانی خۆی بووەو لەو ئاقارەشدا گرنگ نەبووە بە لایەوە کێ زیانی بەردەکەوێت و کێش قازانج، هەر لەو ڕوانگەیەوە دەبینین کە بە زوویی لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆیدا بواری بۆ لەشکری تورك خۆشکرد لە ڕێگای حەڵەبجەوە پەلاماری کوردە ڕاپەڕیوەکانی دیاربەکر بدەن و هەوڵی دامرکاندنەوەی ئەو ڕاپەڕینەی کوردەکان بدەن لە کاتێکدا کە ئینگلیز پێشتر بەڵێنی بە کوردەکان دابوو یارمەتیان بدات کێشەی ولایەتی موسڵ بە جۆرێك یەکلابکرێتەوە لە بەرژەوەندی ئەوان بێت بە مەبەستی دوورخستنەوەی تورکیا لە نفوزو کارتێکردنی یەکێتی سۆڤێتی تازە دروستبوو ئینگلیز پشتی لە کوردەکان کردو تەنانەت دەوری هەبوو لە کپ کردنەوەی ڕاپەڕینی کوردەکانی باکورداو سەرجەم داواکانی کوردی باشوریشی کرد بەژێر پێوەو لە پێناوی بەرژەوەندی ئایندەیی خۆیدا دەوڵەتێکی نوێی بەناوی عێراق دروست کردو ولایەتی موسڵیش کە نیشتمانی کوردەکان بوو، کوردەکانیش مسوڵمانی سونە مەزهەب بوون لکاندنی بەو دەوڵەتە تازە دروستکراوە دەستکردەی خۆیەوە بۆ ئەوەی لە ڕووی مەزهەبییەوە هاوسەنگیەك لە نێوان شیعەو سونەدا دروست بکات، لە لایەکی ترەوە، کوردستان سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ئابوریە چ لە ڕووی سەرچاوەکانی نەوت و کانزاکانەوە چ لە ڕووی ئاوو بەروبوومی کشتوکاڵیەوە، چ لە ڕووی دارستان و لەوەڕگاوە.. هەموو ئەمانەش پێویست بوون بۆ ئەوەی دەوڵەتە تازە دروستکراوە دەستکردەکەی ئینگلیز بتوانێت هەم لە ڕووی مەزهەبییەوە هاوسەنگ بێت، هەم لە ڕووی ئابوریەوە جۆرێك لە بەشی خۆکردن "الأكتفاء الذاتي" دابین بکات، لە پێناوی ئەم ئامانجەشدا ئینگلیز هەموو ماف و ویستە ڕەواکانی گەلی کوردی بە هەمان شێوەی تورکەکان پێشێل کرد. تەنانەت کاربەدەستانی ئینگلیز خۆیان لە نووسراوەکانیاندا ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ ئەو ڕاستیانەیان درکاندووە بە تایبەتی ئەدمۆنز و بێڵ و نۆئێل بە ئاشکرا ئەوەیان گوتووە.

ئەحمەد تەقی لە بیرەوەریەکانیدا لەوە دەدوێت کە چۆن دوای کۆتایی هاتنی شەڕو تەسلیم بوونی عوسمانیەکان، چەکەکانیان تەسلیم بە سوپای ئینگلیز دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ ئەستەمبوڵ هەتا لەگەڵ هاوڕێکانیدا بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی، بەڵام لەوێ ڕێگایان پێنادرێت و پێویستیان بەوەیە بۆ ئەو مەبەستە ڕەزامەندی کاربەدەستانی ئینگلیز وەربگرن هەر لێرەشەوە باسی ئەوە دەکات کە سوڵتانی عوسمانی هەر بەناو مابوو، بە فیعلی ئینگلیز فەرمانڕەوایی ئەستەمبوڵیشی دەکرد. دیسان لەوە دەدوێت کە چۆن لەوێ بە ڕێکەوت پیرەمێرد دەبینێت و ئەویش دەیبات بۆ لای شێخ عەبدولقادری نەهری و شێخ ڕەزامەندیان بۆ وەردەگرێت تا بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی، لە گەڕانەوەدا شێخ عەبدولقادر نامەیەکی پێدا دەنێرێت بۆ شێخ مەحموود و بەمیش دەڵێت: سەلام و حورمەت عەرزی شێخ مەحموود بکەن و پێی بڵێن کە حەددی ئیمکان ئیدارە لەگەڵ ئینگلیزەکان بکات.. هەتاکو بزانین لە مەجلیسی دەولیداو لە تەقسیماتی ئەجزای حوکومەت و جامیعەی عوسمانیدا دەرهەق بە کوردو کوردستان چ قەرارێك ئەدەن.. ل13).

ئەوەی گرنگە بۆ ئێمە تێڕوانینی شێخ عەبدولقادری نەهریە کە بە ئاشکرا دەردەکەوێت بە شێوەیەکی تەواو وەکو تاکە گەلێك و تاکە نیشتمانێك سەیری کوردو کوردستان دەکات و پێی وایە دەبێ شێخ مەحموود نەرم و نیانی بنوێنێت بۆ ئەوەی ئەو دەسەڵاتە سنووردارەی کە بە دەستی هێناوە لە دەستی نەچێت، چونکە پێی وایە با ئەو دەسەڵاتە زۆر تەسك و سنوورداریش بێت، هێشتا زۆر لەوە باشترە کە کورد خاوەنی هیچ نەبێت، دیسان بە دیدێکی ئایندەخوازییەوە دەڕوانێتە داهاتوو، ئومێدی ئەوەی هەبووە کە لە کۆمەڵەی دەولیدا کورد دەستکەوتی زیاتر بە دەست بهێنێت و پێشبینی ئەوەی کردووە کە لە هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانیدا دەشێ بڕیاری جدی بۆ کوردو کوردستان بدرێت و دەشێ پێیشی وابووبێت کە ئەگەر بڕیاری کۆمەڵەی دەوڵەتان بە قازانجی کورد شکایەوە ئەوا دەشێ ئیدارەکەی شێخ مەحمود ببێتە خانە سەرەتاییەکانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی لە کوردستانی گەورەدا. جێگای خۆیەتی ئێمەش لە ئێستادا بەو دیدو ڕوانینەی شێخ عەبدولقادرەوە سەیری ئیدارەی ئێستای کوردی بکەین و وەکو بنەمای ئیدارەی خاوەن ناسنامەو سەربەخۆی ئاینده بۆ کوردستان سەیری بکەین و گونجاندن لەگەڵ بارودۆخی سیاسی و نێودەوڵەتی ئێستا تێبگەین و نە موجازەفەی نەگونجاو بکەین نە پاکانەی ناپێویست بۆ ئەوەی کە کورد تموحی سەربەخۆیی نیە، چونکە هیچ بەڵگەیەك پشتگیری ئەم قسەیە ناکات ئەگەر مرۆڤ بوونەوەرێك بێت حەزی لە ئازادی و سەربەخۆیی بێت، ئەوا کوردیش وەکو نەتەوە تموحی ئازادی و سەربەخۆیی و دەوڵەتی هەیە، دیارە ڕاسپاردەکەی شێخ عەبدولقادر بۆ شێخ مەحمود ڕاسپاردەیەکە کە سەرچاوەکەی ڕۆحی کوردایەتی و نیشتمانی پەروەردەییە، ڕۆڵی گەیاندنی ئەو پەیامەش بە ئێمە ئەحمەد تەقی دەیبینێ و ئەرکی ئەو گەیاندنەش مامۆستا جەلال تەقی بینیویەتی کە ئەرکی ئامادەکردن و چاپکردنی ئەم کتێبەی گرتۆتە ئەستۆ.

دیسان ئەحمەد تەقی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە کاتێ نامەو ڕاسپاردەکەی شێخ عەبدولقادر بە شێخ مەحمود دەگەیەنێت، شێخ مەحمودیش دەڵێت: من تەرفداری ئیدارەکردنم لەگەڵ ئینگلیزەکان وەلاکین ئەوان بەهانەم پێ دەگرن و بە هەموو نەوعێك هەوڵ دەدەن بۆ دەست کورت کردنەوەم.. ل14). لەم قسەیەی شێخ مەحمودا بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کە شێخ مەحمود لەوە تێگەیشتووە

کە ئەو لایەنگری هەر کەسێك دەکات کە لایەنگری دەسەڵاتدارییەکەی ئەو بێت، هەروەها لەوەش تێگەیشتووە کە ئینگلیزەکان لێی بە بیانوون و دەیانەوێت ئیدارەکەی لەناوببەن، کەواتە لێرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە شێخ مەحمود هەموو جارێ کە هەڵوێستی دژی ئینگلیز وەرگرتووە لەخۆوە نەبووە بەڵکو لە کاردانەوەیدا بووە بەرامبەر بە ئینگلیزەکان، هەرچەندە ئەو پرسیارەش سەرهەڵدەدات ئایا شێخ مەحمود نەیدەتوانی بە جۆرێك ڕەفتار بکات کە ئینگلیزەکان ئەو قەناعەتەیان لا دروست بێت کە شێخ مەحمود و کوردەکان لەو ئاستەدان بەرژەوەندییەکانی ئەوان بپارێزن؟

دیسان ئەحمەد تەقی دەڵێت شێخ مەحمود پێی گوتم: "فیکرم هەیە وەکیلم بنێرمە تاران و لەلای سەفارەتی دەوڵەتەکان شکایەت لە ئینگلیز بکەم.. بیرەوەرییەکان. ل15). منیش عەرزم کرد "لام وەهایە ئەستەمبوڵ و تاران و بەڵکە هەموو دونیا لەژێر حوکم و نفوزی ئینگلیزدایەو باوەڕ ناکەم هیچ کەسێك هەبێ شکایەتی بەرنە بەر).. ل 15. ئەگەر سەرنجی ئەو قسەیەی سەرەوەی شێخ مەحموود بدەین ئەوا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە بە چاوێکی زۆر کەم بەهاوە ڕوانیویەتیە ئینگلیزەکان، دەتوانین بڵێین جۆرێك لە تێنەگەیشتن لە سیاسەتی دنیای ئەوکاتەو لە شوێن و دەوری ئینگلیزی پێوە دیارە، ئینگلیزێك کە ئەو نەخشەدانەرو بڕیاردەری سیاسەتی دنیای دوای جەنگی جیهانی یەکەم بێت دەبێ ئەو دەوڵەتانە کێ بن کە شێخ مەحمود وەکیلی خۆی بنێرێتە تاران و لای سەفارەتەکانیان شکایەت لە ئینگلیزەکان بکات! بێگومان دەوری ئینگلیز لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم بە جۆرێك لە جۆرەکان هاوشێوەی دەوری ئێستای ئەمەریکا بووە لە سیاسەت و لە بڕیاری سیاسی دنیادا بەڵام با بپرسین ئایا کەس هەیە ئێستا بتوانێت لە ئەمەریکا بپرسێت بۆچی بەو جۆرە سیاسەت دەکات لە دنیادا؟ هەموومان بینیومانە یان گوێمان لێی بووە کە عێراق چەندین جار شکایەتی لە ئەمەریکاو ئینگلیز کردووە لەسەر ئەوەی کە گوایە فڕۆکەکانیان سنووری ئاسمانی عێراقیان بەزاندووەو نەك هەر بەسەر هەردوو ناوچەی دژەفڕینی باکورو باشووردا فڕیوون بەڵکو چوونەتە ئاسمانی ناوەڕاستی عێراق کە ئەو ناوچەیە لە دەرەوەی ناوچەی دژەفڕینە، کەچی نە ئەنجومەنی ئاسایش و تەنانەت نە جامیعەی عەرەبیش هیچ بایەخێکیان بەو شکایاتانەی عێراق نەداوە.. دەبێ چۆن سەفارەتی دەوڵەتان گوێ لە شکایەتی شێخ مەحمود بگرن؟!

بێگومان بۆچوون و وەڵامەکەی ئەحمەد تەقی لە جێگای خۆیدایە کە دونیا لەو کاتەدا لەژێر حوکم و نفوزی ئینگلیزدا بووەو کەس نەیتوانیووە نەك لێپێچانەوە لەو بکات بەڵکو بە ئاسانی ئینگلیز لە سەردەمی باڵادەستی خۆیدا لە سیاسەتی دنیادا گوێی لە دەوڵەتانی دیاریش نەکردووە، بەڵام لەو ساتەوەختەدا شێخ مەحمود کە دەسەڵاتی سلێمانی و دەوروبەریشی پێ ڕەوا نابینرێت کەچی دەیەوێت شکایەت لە ئینگلیز بکات –ڕەنگە ئەمە دەروازەیەکی تر بێت بۆ تێگەیشتن لەوەی کە بۆچی ئینگلیز بە هەموو شێوەیەك پشتی لە شێخ مەحمود کردو لە ڕێگای ئەویشەوە پشتی لە کوردەکان کردبێت، کە دیارە ئەمەش تاکە هۆ نیە بەڵکو لەگەڵ زۆر هۆکاری تردا ئەو هەڵوێستەی ئینگلیزیان پێکهێنابێت.

بەپێی قسەکانی ئەحمەد تەقی وا لێك دەدرێتەوە کە یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی تێکچوونی نێوان شێخ مەحمود و مێجەرسۆن بە هۆی ئەو هەڵوێستەی شێخەوە بووە، ئەنجامی ئەو تێکچوونەش بە شەڕو لەنێوچوونی دەسەڵاتدارییەکەی شێخ مەحمود و برینداربوون و دەستگیرکردنی و نەفی کردنی خۆیشی کۆتایی هات. بێگومان زۆرجار گەمەی سیاسی و هونەری مامڵەکردن و خۆگونجاندن لە سیاسەتدا دەستەبەری مانەوە بۆ قۆناغی دواتر دەکات، بە داخەوە لە ئەزموونی حوکمڕانی شێخ مەحمودا ئەو گەمە سیاسیانەو خۆگونجاندن لە ئاستێکی لاوازدا بووە، ئەوەش هۆکارێکی گرنگ بووە بۆ لەنێچوونی دەسەڵاتدارییەکەی.

ئەحمەد تەقی بە دوورو درێژی باسی ئەوە دەکات کە چۆن خەڵکی ڕەواندوزو دەورووپشتی و هەندێ لە ئاغاو بەگەکانی ئەو ناوچەیە دەسەڵات بەسەر ڕەواندوزدا دەکەن و پاشانیش بە ویستی خۆیان داوا لەکاربەدەستانی تورك دەکەن کە هێزی خۆی بنێرێتە پشتیوانیان لە دژی ئینگلیز و بۆ ئەو مەبەستەش تورکەکان ئۆزدەمیر دەنێرنە ڕەواندزو پاشان دوای گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی و پەیوەندیکردن لەگەڵ ئۆزدەمیرداو باسکردنی ئەوەی کە شێخ مەحمود ئامادەیە لایەنگری لە



تورکەکان بکات ئەگەر تورکەکان پشتگیری لە دەسەڵاتدارییەکەی شێخ مەحمود بکەن، بۆ ئەو مەبەستەش شێخ مەحمود وەفدێك دەنێرێتە تورکیا کە بریتی دەبن لە فەتاح ئەفەندی و مامۆستا ڕەفیق حیلمی و ئەحمەد تەقی بۆ قسەکردن لەگەڵ تورکەکان لەو بارەیەوە. بێگومان لەوکاتەدا دەوڵەتی عوسمانی شتێکی ئەوتۆی لەدەستدا نەمابوو هەتا بتوانێت پشتگیری دروستکردنی دەسەڵاتێکی کوردی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود لە خوارووی کوردستاندا بکات، پاشانیش کە مستەفا کەمال ئەتاتورك دەوڵەتی نوێی تورکی دامەزراند، هەموو ئەو گریمانانەی کە پێشتر دانرابوون بۆ بڕیاردانی چارەنووسی کورد هەمووی هەڵوەشانەوە ئەگەرچی کوردەکان زۆریان هاریکاری مستەفا کەمالمان کردبوو، بۆیە دوای دروستبوونی دەوڵەتی نوێی تورك ئیتر بارودۆخەکە گۆڕاو ئینگلیزەکانیش لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا پەیوەندی خۆیان لەگەڵ تورکیای نوێ ڕێکخست و کێشەی ولایەتی موسڵیشیان بە ئاراستەیەکی تر برد بە جۆرێك نە کوردو نە تورك لێی سوودمەند نەبوون، بەڵکو خستیانە سەر دەوڵەتە تازە دروستکراوەکەی خۆیان. بەم جۆرە ئیتر ئومێدی پەرەسەندن و مانەوەی دەسەڵاتدارییەکی شێخ مەحمود زۆر لاواز بوو.

ئەحمەد تەقی لەم بیرەوەرییانەیدا باسی حاڵی ئیسماعیل خانی سمکۆ دەکات لەو کاتە بەداوە کە تورکەکان هێزیان ناردە سەری و خێزانەکەیان کوشت و کوڕە منداڵەکەیان دەستگیر کردو خۆیشی ناچار بوو بە ئاوارەیی بچێتە ناوچەی بەحرەکەی هەولێر. بەڵی ئەو گوندەی کە مامۆستا عەزیز گەردی بە پایتەختی هەموو دنیای دادەنێ. لەوێش ئیسماعیل خان دەیزانی کە ئینگلیزەکان هەڵس و کەوت و هەڵوێستی ئەویان بە دڵ نیەو ئەویش ئامادەی هاریکاری نەبوو لەگەڵ ئینگلیزەکاندا، هەرچەندە لەولایشەوە پەیوەندی لەگەڵ تورکەکان خراپ بوو، ئەنجام ناچار بوو بچێتە ناوچەی (باش قەڵا) سنووری وان و لەوێش بە شێوەیەکی ناخۆش ژیان بەسەر ببات. پاشان لە ڕێگای ئەحمەد تەقیەوە پەیوەندی کردن لە نێوان والی قوماندان سلێمان سەبری بەگ و ئیسماعیل خاندا دروست دەبێت و والی بانگهێشتی ئیسماعیل خان دەکات بۆ شاری وان و پێشوازییەکی گەرمی لێ دەکات و بەڵێنی دەداتێ کە هێزێکی باشی سەربازی تورك بخاتە ژێر دەسەڵاتی ئیسماعیل خانەوەو خۆیشی ئەتوانێ لە خەڵکی عەشایرو دانیشتوان کێ کۆبکاتەوە ئازادەو پێشی دەڵێت لە سەرەتاوە بچێتەوە ناوچەکانی خۆی لە ڕۆژهەلات و کاروبارەکانی یەکلابکاتەوەو پاشان بەو هێزەوە بچێتە سلێمانی بۆ یارمەتیدانی شێخ مەحمود بە دژی ئینگلیزەکان. بێگومان ئیسماعیل خان بەم کارە زۆر دڵخۆش دەبێت، بەڵام لە ئەنجامی نزیکبوونەوەی مستەفا کەمال و ئینگلیز لەیەکتر ئەو کارە سەری نەگرت.

بەڵی لێرەوە دەردەکەوێت کە چ شێخ مەحمود و چ ئیسماعیل خانیش مەیلی زیاتریان بەلای تورکەکاندا هەبووەو چاوەڕوانی هیچ شتێکیان لە ئینگلیز بۆ کورد نەکردووە، کوردیش لەنێو ئەو بەرژەوەندییە بەناویەکداچووانەی ئینگلیز و دەوڵەتانی تردا بە ئاسانی هەڵسوکەوتی بۆ نەکراوەو نەیشیزانیووە چۆن خۆی ڕێکبخات و بگونجێنێت، بێگومان لەو واقیعە کۆمەڵایەتییە دواکەوتووەی ئەوکاتەی کوردستانیشدا ناکرێت گوناهەکە بە تەنیا بخرێتە ئەستۆی سەرکردەکان، بەڵکو ئاغاو بەگ و شێخ و سەرخێڵەکانیش زۆرێکیان دەوری خراپیان بینیوەو خەریکی پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان بوون و مەسەلەی میللەتیان لە دوای بەرژەوەندی خۆیان داناوە.

ئەم بیرەوەرییانەی ئەحمەد تەقی بایەخی تایبەتی خۆیی هەیە چونکە ئەحمەد تەقی خۆی لەناو گەرمەی ڕووداوەکاندا بووە، هەروەها ئامادەکردنی و پەراوێز بۆ نووسینەکەی مامۆستا جەلال تەقیش ئەرکێکی گرنگ و پڕ بایەخەو دیسانەوە لێهاتوویی و دڵسۆزی ئەو پیاوە دەسەلمێنێت بۆ خزمەتی نەتەوەکەی، بەڵێ پیاوێك لەگەڵ چەندین پیاوی تر چووە وڵاتی سۆڤیەت، زۆریان ئەدەبیان خوێند کەچی نەیانتوانی دیستۆفسکی و گۆگۆڵ و چیخۆف و تۆرگۆنیف و لێرمانتۆف و بلنسکی بناسن کەچی جەلال تەقی ئەندازیاریی خوێندو نەك هەر ئەم نووسەرە گەورانەی ناسی بەڵکو بە خوێنەری کوردیشی ناساندن.. سڵاو لە گۆڕی جەلال تەقی.. ئاسودەیی بۆ گیانی ئەو گیانەی کە بە پێچەوانەی "گیانە مردووەکانی" گۆگۆڵەوە.. ئەم هەمیشە زیندووە.



ماموٚستای گەورەو بەڕێز

کاکە جەلال

سلاّوت لیّ ئەکەم و هیوام خۆشیتە

براگیان ئەو دەفتەرەی کە باسەکەی "سمایل خانی سمکۆ و سەدەیەک لە تێکۆشانی کوردی ئێرانی تێدایە لای من ڕەشنووسەو پێویستی بەوە دەکات لە ڕوی زمان و هەڵەی ڕێزمانییەوە چاک بکرێت بە وردی. زۆر زۆر سوپاست ئەکەم وەکو برایەکی زۆر خۆشەویست و گەورەم لەگەڵ ئەوەشدا خۆت کارت زۆرە بۆم جێبەجێ بکەیت بە وردی بۆ ئەوەی کە پاک نووسم کرد هیچ تەنگوچەڵەمەیەکی تێدا نەبێ و زمانەکەی ڕەوان بێ، چونکە ئەیبەم بۆ بەغدا، لەوێ دوکتۆر کەمال ئەحمەد مەزهەر پەیمانی پێداوم پێشەکییەکەیم بۆ بنووسێت. لای جەنابیشت ئەگەر هەتاکو سەری مانگیش تەواو ببێت قەیناکەو تکام وایە لەبارەی هەڵسەنگاندنیەوە چی تێبینییەکیشت هەیە پێم بڵێیت مەمنون ئەبم.

تێبینی: کاکە گیان هەموو ئەو هەڵانەی کە هەیە هەر لەسەر دەفتەرەکە بۆم چاک بکە

(392) تێبینی چاک کردنم لەم کتێبەدا تۆمار کردووە لەسەر ڕوونوسەکەی نوسیومە.

ئیتر خۆشیت

براتان

کەمال نوری مەعروف

بەڕێوەبەرێتی ئاو

سلێمانی 1988/8/16



ماموٚستای گەورەو بەڕێز

کاکە جەلال

سلاّوت لیّ ئەکەم و هیوام خۆشیتە

براگیان ئەو دەفتەرەی کە باسەکەی "سمایل خانی سمکۆ و سەدەیەک لە تێکۆشانی کوردی ئێرانی تێدایە لای من ڕەشنووسەو پێویستی بەوە دەکات لە ڕوی زمان و هەڵەی ڕێزمانییەوە چاک بکرێت بە وردی. زۆر زۆر سوپاست ئەکەم وەکو برایەکی زۆر خۆشەویست و گەورەم لەگەڵ ئەوەشدا خۆت کارت زۆرە بۆم جێبەجێ بکەیت بە وردی بۆ ئەوەی کە پاک نووسم کرد هیچ تەنگوچەڵەمەیەکی تێدا نەبێ و زمانەکەی ڕەوان بێ، چونکە ئەیبەم بۆ بەغدا، لەوێ دوکتۆر کەمال ئەحمەد مەزهەر پەیمانی پێداوم پێشەکییەکەیم بۆ بنووسێت. لای جەنابیشت ئەگەر هەتاکو سەری مانگیش تەواو ببێت قەیناکەو تکام وایە لەبارەی هەڵسەنگاندنیەوە چی تێبینییەکیشت هەیە پێم بڵێیت مەمنون ئەبم.

تێبینی

کاکە گیان هەموو ئەو هەڵانەی کە هەیە هەر لەسەر دەفتەرەکە بۆم چاک بکە

ئیتر خۆشیت

براتان

کەمال نوری مەعروف

بەڕێوەبەرێتی ئاو

سلێمانی 1988/8/16

(٣٩٢) تێبینی

چاک کردنم لەم کتێبەدا تۆمار کردووە لەسەر ڕوونوسەکەی نوسیومە

بەڕێز هەڤاڵی تێکۆشەرو هێژا، کاك......

سڵاوێکی پاك و بێگەردی کوردانە

هەڤاڵی بەڕێز، پتر لە شەش مانگ لەمەوبەر یاداشتێکمان پێشکەش بە بەڕێزتان کرد. لەبارەی یارمەتیدان و چاپکردنی (فەرهەنگی زمانی یەکگرتووی کوردیەوە. بەو هیوایەی کە بە دەنگمانەوە بێن و یارمەتیان بدەن بۆ چاپکردن. ئەو فەرهەنگەی، کە هەنگاوێکی گەورەیە بۆ یەکسختنی زمانی کوردی، چەند ساڵێکە شەونخونی لەگەڵ دەکێشین وشەی هەمووی شێوە زارەکانی کوردی گرتۆتەوە و تەنها پیتی ئەلف پتر لە (12000) دوازدە هەزار وشەی گرتۆتە خۆی و ئەوەش نزیکەی شەش ئەوەندەی پیتی ئەلفی هەموو ئەو فەرهەنگە کوردیانەیە کە هەتا ئێستا دەرچوون، بەڵام بە داخەوە پاش بەسەرچونی ئەم ماوە درێژە بەسەر پێشکەشکردنی یاداشتەکەماندا هەتا ئێستا هیچ وەڵامێك و ئەنجامێکمان لە بەڕێزتانەوە پێنەگەیشتوە.. هیوادارین بە چاوێکی پڕ بایەخەوە بڕواننە ئەم کارەمان کە گرنگە بۆ گەلە ستەمدیدەکەمان و بەردێکی پتەو دەبێ لەگەڵ هەوڵ و کۆششی دڵسۆزاندا بۆ یەکگرتنی زمانە شیعریەکەمان و بەشێکی تر ئەبێ لە ئەنجامی تێکۆشانی درێژخایەنی بەڕێزتان.

**تێبینی:**

**دەقی دەستنووسی نامەی جەلال تەقی بۆ یەکێك لە سەرکردەی حزبەکان،**
**بەڵام لەبەر کوژانەوەی ناوەکەی نازانرێت بۆ کێی نوسییوە.**





مۆسکۆ – 1967/7/3



هاوینی 1964 – مۆسکۆ



تەمموزی 1963 – لە چایکا
(سۆچی) – ڕوسیا



مینسک / هاوینی 1963



سوچی / 1963



لەڕاستەوە ئەمینی شێخ جەلال، جەلال
تەقی، محەمەد حەسەنی ئەندازیار – 1963



تەمموزی 1963 سوچی (چایکا)



مۆسکۆ / 1963 – هۆڵی وانە خوێندن



لەگەڵ ئەندازیار حەمە حەسەندا / 1963 چایکا



1957 کوردستان



هاوینی 1964 لەگەشتێکدا لەگەڵ هاوپۆلەکانی زانکۆی



زستانی 1964 روسیا



فەرمانگەی ئەشغالی سلێمانی 27/12/1984



سلێمانی/1981–یەکەم دانە لای ڕاستەوە لەکاتی
سەرپەرشتیکردنی کاری ئەندازیاریدا



لەگەڵ لانەی کچیدا – 31/12/1987